# ئەو ئایەتانەی سەرنجیان ڕاکێشام

نووسینی: عبداللە خاکی

بسم الله الرحمن الرحيم



## ناسنامەی کتێب

ناوی پەرتووک: ئەو ئایەتانەی سەرنجیان ڕاکێشام

نووسینی: عبداللّٰه خاکی

نـەخـشەسازیی بەرگ: اخلاص دیزاین

نـەخـشەسازیی ناوەوە: نووسەر

(لَقَدْ أَنزَلْنَا إِلَيْكُمْ كِتَابًا فِيهِ ذِكْرُكُمْ أَفَلَا تَعْقِلُونَ)

سورەتی الأنبیاء: ١٠

بێگومان ئێمە کتێبێکمان ڕەوانە کردووە بۆتان کە یاداوەریە و سەربەرزی ئێوە لە شوێنکەوتنیایەتی، ئایا ئەوە بیرو هۆشتان ناخەنەکار و ژیر نابن؟

# پێشكەشە

- بە باوك و مامۆستای خۆشەویستم كە بۆیەكەمجار فێری قورئانی كردم.
- بەوانەی لە گشت كارو بارێكدا قورئان ئەكەنە چرای ڕێگایان.
- بەوانەی لە هەر كات و سات و شوێنێك بێ یادی قورئان ئەكەنەوە.
- بەوانەی ئاوات و هەوڵیان بڵاوكردنەوەی حوكمی قورئانە لە كۆمەڵگا.
- بەوانەی بۆ جارێكیش بێ ناویان لە نزاو دوعاكانیان هێناوم.

خاكی



# پێشەکی نووسەر

**الحمدللَّه الذي هدانا للإيمان، وشرفنا بالسنة والقرآن، والصلاة والسلام على من أنزل عليه الفرقان، هدى للناس وشفاء للصدور والأبدان. أما بعد**

ئەم کتێبە بریتیە لەو ئایاتانەی لە کاتی خوێندنەوەی سەرنجیان ڕاکێشاوم، و بیر و هۆشیان بردووم، کاریگەر بوومە پێیان، بۆیە وویستم سەرنجی ئێوەی خوێنەریش بەلای ئەو ئایەتە پیرۆزانە ڕابکێشم، و بەڵکو سوودی هەبێ بۆ دونیا و دوارِۆژمان، قورئان تەنها خوێندنەوە نیە بەبێ تێگەیشتن، بەڵکو ئەم قورئانە دەبێ لێی تێبگەی و وات لێ بکات، سنورەکانی حەرام و حەڵال، کوفر و ئیمان بزانی و شارەزابی، دەبێ وامان لێ بکات زیاتر ببینە بەندەی اللَّه تعالی، و دوورمان بکاتەوە لە هەموو خوایەکی باتل و پوچ، دەنا خوێندنەوەی بە تەنها سوودی نیە.

ئەم کتێبە سەرنجت ڕادەکێشێ بۆ ئایەتانێکی پڕ لە جوانی و گەشبینی، وە ئایەتانێکی پڕ لەترس و وشیارکەرەوە، وە ئایەتانێکی پڕ لە هەڕەشە و تۆقاندن بۆ زاڵم و ستەم کاران، و ئایەتانێکی ئاگادارکەرەوە لە هەڵخەڵتاندن بە دونیا و چۆنیەتی ژیان تێیدا، وە دەیان ئایەتی تری پڕ لە سوود و ئامۆژگاری، تێیدا نووسراون.

ئەم کتێبە بۆ کەسانێك کە بە دڵ و هەستەوە دەیخوێننەوە وانە و پەندی زۆری تێدایە، کە لەکاتی خوێندنەوەی چاویان دێنێتە گریان و دڵەکانیان فرمێسکی خوێنینی لێ دێنێ، بەهۆی کاریگەری ئایەتەکانی قورئان، هەر وەکو اللَّه تعالى دەفەرمووێت: ﴿إِنَّ فِي ذَٰلِكَ لَذِكْرَىٰ لِمَن كَانَ لَهُۥ قَلْبٌ أَوْ أَلْقَى ٱلسَّمْعَ وَهُوَ شَهِيدٌ﴾[1]

واتە: بێگومان لەو بەسەرهاتانەدا، ئامۆژگاری هەیە بۆ ئەو کەسەی دڵ و ژیری هەیە، یان بەباشی گوێ ڕاگرێ و ئامادەش بێت دڵ و گوێی بداتێ. بۆیە خوشکی من برای ئازیزم، هیوادارم لە ناخی دڵتەوە ئەم چەند ئایاتانەی سەرنجیان ڕاکێشاوم بیخوێنیتەوە، و لەسەریان بوەستەو ماوەیەك بیریان لێ بکەوە، لێیان تێبگە، پشتیوان بە اللَّه تعالى سوودێکی دەبێت، بۆ بەختەوەربوون و سەرفرازیت لە دونیا و دوارۆژ.

ئینجا لەم ڕۆژگارەی ئەمڕۆمان تاکە شت هەبێ پشتی لێکرابێ، تەنها قورئانە، موسڵمان بۆ هەموو شتێکی دونیایی، پارە و ژن و خۆشیەکان خەمیەتی هەوڵیان بۆ ئەدات، ناوەستێ تاکو بەدەستی دەهێنێ، بەڵام هیچ خەمی ئەوەی نیە قورئان فێربێ و لێی تێ بگات و کاری پێ بکات، بیزانن ڕەحمەتتان لێ بێت، قورئان تێگەیشتن و لێوردبوونەوە و کار پێکردنی

---

[1] - سورەتی ق ئایەتی: (٣٧)

دەوێت، ئەگەر سەرنج بدەین لە قورئان دا اللّٰە تعالی نەیفەرمووە: (أفلا یختمون) ئەوە بۆ خەتمی قورئان ناکەن! بەڵکو اللّٰە تعالی فەرموویەتی:

(أفلا یتدبرون) بۆ لێی وردنابنەوە.

(أفلا یعقلون) ئەوە بۆ مێشکیان بەکارناهێنن.

(أفلا تتفکرون) ئەوە بۆ بیرناکەنەوە.

(أفلا ینظرون) ئەوە بۆ سەرنج نادەن.

من دژی بیرۆکەی خەتم کردنی قورئان نیم، جارێك و دوو جار و دەجار لە ڕەمەزان دا و غەیری ڕەمەزان، بەڵکوو دژی ئەو مامەڵەیەم کە لەگەڵ قورئان دەکرێت، کە وەکو مینگە مینگ خێرا بەسەریدا تێدەپەڕیت و یان دەیکەنە پێشبرکێ بزانن کامەیان زۆرترین خەتمی قورئان دەکات، بێ ئەوەی سەرنجبدەن و بیر لەو ئەمر و نەهیانە کە اللّٰە داوات لێ دەکات، یان دوور لە تێگەیشتن لەو وانە و پەندانەی کە لە چیرۆک و بەسەرهاتانەی قورئاندا هەن بەڵکوو وەکو ڕۆمان، و چیرۆکێک دەیخوێننەوە گەر تێی بگەن، گەر تێی نەگەن هەر هیچ، بەتەمای ئەوەیە کە لە هەر پیتێک دە چاکەی دەست کەوێت کە ئەمە وانیە، هەر چەندە ئەجر و پاداشتی خوێندنەوەی قورئان تەنها بۆ ئەو کەسانەیە کە کاری پێدەکەن و وە زۆر زیاتریشە لەوەی کە بۆ هەر پیتێک دە چاکە بێت.

کەوایە ژمارەی خەتمەکانی قورئان و یان زۆر خوێندنی هیچ سوودت پێ ناگەیەنێت گەر بەکردەوە یان قسە و فکر دژی قورئان بیت و هەمان ئەو ئیمانەت نەبێت کە اللّٰە لێتی دەیەوێت لە قورئاندا.

خوێندنەوەی یەك ئایەت بە تێگەیشتن و کارپێکردنی زۆر باشتر و خێرترە لە خەتم کردنی دەجار گەر بەس بۆ خوێندنەوە بێ بەبێ کار پێ کردنی.

پێشەوا ئیبن تیمییە (بە ڕەحمەت بێت) دەفەرمووێ: بێگومان هەر کەسێك کتێبێك لە بەشەکانی پزیشکی یان ژمێریاری یان کتێبی تر بخوێنێتەوە پێویستە لەسەری ڕامێنێت لە مانا و واتاکانی، ئەو کەسەی قورئان دەخوێنێتەوە دەبێ چۆن تێڕابمێنێت بێگومان قورئان هیدایەتە، وە بە قورئان حەق و باتل، و خێر و شەڕ دەناسێت، مەبەست لە قورئان تەنها زانینی خوێندنەوە نییە بەبێ تێگەیشتن لێی.[1]

وە تێگەیشتن و ورد بوونەوە لە قورئان هۆکارێکە بۆ ڕێنمونی بوونی کەسەکە بۆ ڕێگای ڕاست، چونکە هەر کەس لە ماناو مەبەستەکانی ئایەتەکان تێ بگات، ئیلا بیروباوەڕی بۆ ڕێگای ڕاست دەگۆڕێ،

---

[1] ـ بڕوانە: مجموع الفتاوى:٧/٧٤.

وە سوپاس بۆ اللَّه تعالی کە وای لێکردم ئایەتە پیرۆزەکانی سەرنجم ڕابکێشیێ، هەرجارێك خەتمی قورئانم کردووە، ڕۆژانە کە بەشەکەم خوێندۆتەوە، گەر ئایەتێک کاری لێکردووم و سەرنجی ڕاکێشاوم، لە موبایل سورەت و ژمارەی ئایەتەکەم ئەپاراست، دواتر سەرنج و تێرمانم لەسەر ئایەتەکان ئەنووسی، و ڕۆژانە لە پەیج و کەناڵەکەم بڵاودەکردەوە، بۆیە بڕیارمدا هەموو کۆبکەمەوە، بیکەمە کتێب، بەڕاستی بیرکردنەوە و ورد بوونەوە لە قورئان تام و چێژێکی تایبەتی هەیە، ڕووح و دەروون ئارام دەکاتەوە.

پێشەوا تەبەری (بە ڕەحمەت بێت) دەفەرمووێ: سەیرم پێ دێت کەسێك قوڕئان دەخوێنیتەوە، بەڵام لێکدانەوەکان و ماناکانی نازانێ جا چۆن تام و لەزەت لە خوێندنەوەی دەکات.[1]

داواکارم لە اللَّه تعالی ئەم کارەمان لێ قبوڵ بکات و لە ڕۆژی دوایی بمانخانە بەر شەفاعەتی قورئان.

**اللهم اجعلنا من أهل القرآن الذين هم أهلك وخاصتك، يا ذا الجلال والإكرام**

سێ شەمە/ ١١ ربيع الاول ١٤٤٥

٢٦/٩/٢٠٢٣

براتان: عبداللَّە خاکی

---

[1] - بڕوانە: معجم الأدباء: ٦٣/١٨.

## ١ ئەم ئایەتە سەرنجی ڕاکێشام

مرۆڤ لە بارو زروفێک ژیانی ناوەستێ، کە بەردەوام دڵخۆشبێ، یان خەم باربێ، سەرەڕای ئەو هەموو بەخشش و نازو نیعمەتانەی اللَّـە تعـالی کـە پێی بەخشیوە، زۆر سپڵە و بێ وەفایە، گەر لە ژیان کەسێک چاکەیەکی لەگەڵ کردبێ لەبیری ناکەی و بەردەوام لە فکر و خەیاڵتە، کەچی پاک و بێگەردی بۆ اللَّە تعالی، زوو بەرامبەر بەخششەکانی اللَّە سپڵە و بێ وەفـا دەبن، و بە یاسا و بەرنامەکەی ڕازی نـابن و دژایەتـی دەکەن، بە یاسـا و بەرنامەی دەسکردی مرۆڤەکان ڕازی دەبن و عەلمانیەت و دیموکراسـی و شوعی و سۆشیالسـت و مـارکس دەکەنە بەرنـامەی ژیانیـان، کـوفرانە و سپڵەی و تەنها ئەوەنیە سوپاسی نازو نیعمەتەکانی اللَّـە نەکەی، بەڵکـوو ڕازی بـوون بە بەرنـامەو ڕێسـای مرۆڤەکـان و قبـوڵ نەکردنـی ئیسـلام ئەوپەڕی سـپڵەی و بـێ بـاوەڕییە، گشـت بەرنامەکـانی دونیـا ئامانجیـان تێرکردن و ڕابواردنی کۆمەڵە کەسێکە، و گشتی زووڵـم و زۆرداری و بـێ ڕەوشتی و بەد ڕفتاریە، مرۆڤ دەبێ بەتەنها ئەو خوایە بپەرسـتێ کە ئەوی دروست کردووە و ئەی ژیەنێ و ئەی مرێنێ، بۆیە اللَّە تعالی ڕوو دەکـاتە مرۆڤەکان و پێیان دەفەرمووێ: چۆن کوفرانەم دەکەن، لە کاتێکدا ئێوە بێ گیان بوون و ئێوەم هێنا ژیان و دەتان ژییەنم و دەتان مرێنم،

﴿كَيْفَ تَكْفُرُونَ بِٱللَّهِ وَكُنتُمْ أَمْوَٰتًا فَأَحْيَٰكُمْ ۖ ثُمَّ يُمِيتُكُمْ ثُمَّ يُحْيِيكُمْ ثُمَّ إِلَيْهِ تُرْجَعُونَ﴾[1]

واتە: خەڵکینە چۆن بێ بڕوا دەبن بە اللّٰە لە کاتێکدا ئێوە بێ گیان بوون (لە توێی خاکدا) اللّٰە (دروستی کردوون) و گیانی بەبەردا کردن، پاشان دەتانمرێنێت و دوایی زیندووتان دەکاتەوە، ئەوسا هەر بۆ لای ئەویش دەبرێنەوە.

کەوایە ئەو پەڕی جاهیلی و بێباوەڕییە مرۆڤ سپڵە و بێ وەفابێ بەرامبەر نازو نیعمەتەکانی اللّٰەی خاوەن عەرش، دەبێ هەر ئەو بپەرستین و بە یاسا و ڕێساو حوکمی ئەو ڕازی بین و تەنها ڕێبازی ئەومان قبوڵ بێ کە تەوحیدە، بۆیە گەر ئەتەوێ لە دونیا سەرفرازبی و لە دواڕۆژیش بەهەشت پاداشتت بێ ئەوە تەنها ببە بەندەی اللّٰەی خاوەن عەرش، دووربە لە هەموو یاسا و بەرنامە دەسکرد و خوایە پوچەکان، دڵنیابە ئەوکاتە لە کاروانی سەرفرازان دەبیت.



[1] - سوڕەتی البقرة ئایەتی: (٢٨)

## ٢ ئەم ئایەتە سەرنجی ڕاکێشام

براو خوشکان گومان لەوەدا نیە کە تێکرای مرۆڤ و گشت بونەوەرێک، اللَّه تعالى خاوەنیەتی و هەر ئەویش دروستی کردووین، بۆیە مرۆڤەکان هەریەکەو ڕەنگ و زمان و شێوەیەکن، هەیە چاوی کوێرە، و هەیە گوێی نابیستە، هەیە کورتە باڵایە، یان درێژە، یان هەر شێوەی تر، یان کەسی وایە زۆر جوانەو خەڵک پێی وایە کەس لەسەر زەوی لەو جوانتر نیە،

﴿هُوَ ٱلَّذِى يُصَوِّرُكُمْ فِى ٱلْأَرْحَامِ كَيْفَ يَشَآءُ ۚ لَآ إِلَـٰهَ إِلَّا هُوَ ٱلْعَزِيزُ ٱلْحَكِيمُ﴾[1]

واتە: تەنها ئەوە، بتوانێ لە مناڵدانی دایکتاندا هەرچۆنێك حەزبکا، نەخشەی سەروسیماو روخسارتان بکێشێ: یەکێ رەش پێست، یەکێ سپی پێست، یەکێ نێر، یەکێ مێ، یەکێ باڵابەرز، یەکێ کورتە باڵا، واتە: بە ئارەزووی خۆی نەخشە دادەڕێژێ و گەڵاڵەی هەموو شتێ دەکات، جگە لە خۆی هیچ پەرستراوێکی تر نیە هەق بێت، هەرخۆیشی باڵادەست و زاڵە، زۆر کارزان و کاردروستە، هەمووشتێکی لەجێگەی خۆیدایە.

بۆیە پرسیار لە هەر کەسێک بکەی بە موسڵمان و غەیرە موسڵمان کە کێ مرۆڤی دروست کردووە، لە وەڵامدا ئەڵێت: اللَّه تعالى،

---

[1] - سورەتی ال عمران، ئایەتی: (٦)

کەوایە بێ عەقلی و جاهیلی ئەو پەڕی نەزانینە، تۆ ڕەخنە لە شێوەی مرۆڤەکان بگریت و گاڵتەیان پێ بکەیت، شێوە و ڕووخسارەکان دروست بوونیان گشتی بەپێی خواستی ئێمە نەبووە، بۆیە مرۆڤەکان هەرچۆنێک لە ڕووی ڕووخسار جوان و ناشرین بن لای اللّٰـه تعالی لێ پرسینەوەیان لێناکرێت، بەڵکو اللّٰـه تعالی وای دروست کردووینە، بەڵام لە ڕووی ڕەوشت و ئەخلاق کێشە نیە گلەی لە ڕەوشت و ئەخلاقی کەسەکان بکرێت، کە بۆچی دزی و زینا و زمان پیسە، چونکە اللّٰـه تعالی مرۆڤەکانی لەم ڕوویەوە ئازاد و سەربەست کردووە کە چاکە یان خراپە دەکات، چونکە لە قیامەت لێیان دەپرسێتەوە.

بۆیە بیزانن ڕەحمەتتان لێ بێت تەنها پاداشت لەسەر شتێک وەر دەگیرێت لای اللّٰـه تعالی کە بەرو بومی ماندو بوونمان بێت، نەک شێوە و قەومیەت و نەسب و زمان کە بێ وویستی خۆمان بووە و بەڵکوو، بە وویستی اللّٰـه تعالی بووە.

کەوابوو لە اللّٰـه بترسێ و ڕەخنە مەگرە لەزمان و قەوم و شێوەی هیچ مرۆڤێک.



## ٣ ئەم ئایەتە سەرنجی ڕاکێشام

ژیانی دونیا بۆ گاڵتە و گەمە دروست نەکراوە، کە مرۆڤ بیر بکاتەوە بەس ڕابوێرێ، و هەرچی شتی خۆشە نەفس حەزی لێیەتی بەدەستی بێنێ و ئیتر تەواو لێ پرسینەوەت لێ ناکرێ، ئینجا دژایەتی بەرنامەی دروستکەری اللّٰەی خاوەن عەرش بکە، و هەرچی کوفر و نیفاق و خراپە و تاوان هەیە ئەنجامی بدە، زووڵم و زۆرداری و غەدر و ناپاکی لە خەڵکی بکە، بە کورتی ئەمە ژیانی کەسانی بێباوەڕە، بۆیە اللَّه تعالی باسی سزاو ئازار و پاداشتی ئەم جۆرە کەسانەمان بۆ دەکات، لە ڕۆژی دوایی بۆ ئەوەی پەند و وانەی لێ وەربگرین و ڕێگای تەوحید و ئیمان بگرینە بەر، کە حاڵیان لە نێو چ سەختی و ناخۆشی و ئازار دایە، خراپترین سزا دەدرێن، لە نێو جەهەنەم کە پێستیان سوتێندرا دووبارە پێستەکەیان نوێ دەکرێتەوە و دەسووتێندرێتەوە، بۆ ئەوەی زۆرترین چێژی سزا ببینێ، هەروەکو اللَّه تعالی دەفەرموێت: ﴿إِنَّ ٱلَّذِينَ كَفَرُواْ بِـَٔايَٰتِنَا سَوْفَ نُصْلِيهِمْ نَارًا كُلَّمَا نَضِجَتْ جُلُودُهُم بَدَّلْنَٰهُمْ جُلُودًا غَيْرَهَا لِيَذُوقُواْ ٱلْعَذَابَ﴾[١] واتە: بێگومان ئەو کەسانەی بە ئایەت و نیشانەکانی ئێمە بێ باوەڕن لە دوارۆژدا دەیانبەینە

[١] - سوڕەتی النساء ئایەتی: (٥٦)

ناو ئـاگرێکی بڵێسـەدارو گەرمـەوە ئـەیانبرژێنێ هـەرجارەی کـە پێسـتی جەستەیان داپلۆخاو سووتا چەند پێسـتێکی تریـان بۆئـەگۆڕین لـە جێـی ئەودا تاپتر ئەو سزایە بچێژن.

بەڵـێ ئەمە حـاڵی کـافران و بێبـاوەڕانە کە لە دونیـا غەرقـی خۆشـی و ڕابواردن بووبوون، بۆیە ئەم سزا سەختە ئەدرێن، کەوابوو ڕەحمەتـت لـێ بێ با لە ئێستاوە تـاکو لە ژیـانین ڕێگـای تەوحیـد بگـرینەبەر بـۆ ئەوەی دووربـین لە ناخۆشـی و ئـازاری ڕۆژی دوایـی، ئـێمە لە دونیـا بەرگەی سووتان ناگرین، زۆرجـار لەکـاتی ڕوون گەرم کـردن بـۆ چێشـت لێنـان، دڵۆپەی زۆر بچوک بە پێستت کەوتووە ئازارەکەی چەندە زۆر بووە! ئەی دەبێ چۆن بێ کاتێ تەواوی لاشەت بسـووتێ و دووبـارە نـوێ بێـتەوە و بسووتێتەوە!

کاتێ ئەبینی لە دواڕۆژ حاڵی کافران چۆنە تـۆش لە ژیـانی و بیـرت هەر لای دونیا و خۆشیەکانی بێت، بەڕاسـتی شـەرمەزارییە و ڕیسـوابوونە بـۆ ئێمە، ئەی خاکمان بەسەر تا نەمردوین فرسەتە با پەیمان بدەین تا لە ژیانین بۆ ڕەزامەندی اللَّە تتێبکۆشین، تاکو سەرئەنجام بەهەشت دەبێـتە شـوێنی مانەوەی هەمیشەیمان.



## ٤ ئەم ئایەتە سەرنجی ڕاکێشام

ژیانی دونیا گشتی بەخۆشی و ناخۆشیەوە بۆ تـاقیکردنەوەی مرۆڤەکـانە، گەر تۆ بەهۆی نەخۆشیەکەت بێ هیوابـووی لە ژیـان و واگومـان دەبەی ئیتر چاک نابیتەوە، یان ئاواتێکت هەیە و بۆت نەبووە، یان هاوسەرگیریت دواکەوتووە و هاوڕێکانت هەموو کردوویـانە، تـۆ بـێ هیـوا و بـێ ئەمەل بووی، یاخود منداڵت نەبووە و هەر چاوەڕێی، گومانێک لە دڵت دروست بووە و وادەزانی اللَّه تعالى ئاگای لە حاڵ و خەمی ناخت نیە، ئەوە بزانە زۆر هەڵەی.

بۆیە دەبێ موسڵمان ئەوە بزانێت کاروبـاری هـەرچی بونـەوەرە لـە دونیـا، مرۆڤ و جن، ئاژەڵ و باڵندە، دار و بەرد، گیاندار و بـێ گیـان، هـەرچی شتێک بوونی هەیە لەسەر زەوی و لە ئاسمان، هەمووی لـە ژێـر فـەرمانی اللَّهی خاوەن عەرشە و بۆ چاوتر وکانێک و ساتێکی کەمیش لێیان بێئاگا نییە و ئاگاداری ترپەی دڵیانە، ئەوەتا اللَّه تعالى هیـوایەک ئەبەخشـێ بە دڵە بـێ هیواکـان و باسـی وەرینـی گەڵای دارەکـان دەکـات، کە هـیچ گەڵایەک بێ فەرمان و ئیزنی ئەو هەڵناوەرێ و ئاگاداریانە.

﴿وَمَا تَسْقُطُ مِن وَرَقَةٍ إِلَّا يَعْلَمُهَا﴾[١] واتە: هیچ گەڵادارێكیش بێ ئاگاداری و فەرمانی ئەو ناوەرێت.

ڕەحمەتت لێ بێت بیزانە هەر بڕیار وایە لەم ژیانەی دونیا بڕۆین و كۆچ بكەین، هێندە خۆتانی پێوە خەمبار مەكەن خۆشبەختیەكانتان هەر بە تەنها بەم ژیانەوە مەبەستنەوە، ئایە سەر قاڵیەكانی ئەم ژیانە لەبیری بردووینەتەوە ژیانێكی نەبڕاوە چاوەڕێمانە لە دواڕۆژ كە بەهەشتی پڕ لە نازو نیعمەتە.

كەوایە گەر تۆ بەندەیەكی ڕاستگۆ و دڵسۆز بی لە جێبەجێكردنی فەرمان و نەهییەكانی اللَّه تعالی، دڵنیابە ئاواتەكانت دێنێتە دی، گەر ڕۆژێك لە تەمەنت مابێ، بۆ اللَّه تعالی بژیی و خۆت ڕادەستی بكە و سوپاسگوزار بە لەسەر ناخۆشی و دڵتەنگییەكانی دونیا لەوەی دێتە ڕێت، خوایەك ئاگاداری هەڵوەرینی گەڵای داربێ چۆن ئاگاداری خەم و ئازاری ناخی تۆ نیە، كەوایە بەردەوام ئارامگر و سوپاسگوزاری اللَّە تعالی بە تاوەكو سەركەوتوو بی لە دونیا و دواڕۆژ و بەهەشت دەبێتە پاداشتت.



[١] - سورەتی الانعام، ئایەتی: (٥٩).

## ٥ ئەم ئایەتە سەرنجی ڕاکێشام

خاوەنی گشت بونەوەر و زەوی و ئاسمان و تەواوی گیان لەبەران الـلەی خاوەن عەرشە، هەر خۆی دەسەڵاتدار و پادشا و خاوەن بڕیاری تەواوی بونەوەرە.

ئەگەر کەسێک لە ژیانی دونیا خـاوەنی سـعاتێک، خـانوویەک، ژنێـک، موبایل بێ، قبوڵ ناکات و ڕازی نیە هـیچ مرۆڤێـک لەگەڵ خـۆی بکـاتە هاوبەش، بزانە بۆ شتێکی کەم و بێ نرخ ڕازی نیە کەس بکاتە شەریک و هاوبەشی خۆی، پاك و بێگەردی بۆ اللّٰـە تعـالی، ئەی چـۆن دەبـێ ئـێمە هاوبەش و شیرک بڕیار بدەین بۆ اللّٰەی خاوەنی زەوی و ئاسمانەکان.

سەیر بـکەن اللّٰـە تعـالی لە قورئـان دا ئاگـادارییەکی توونـد ڕووبەڕووی مرۆڤەکان و هەتا پێغەمبەرانیش (سەلامی اللّٰە تعالی لە هەموویـان بێـت) دەکات، لەسەر شیرک و هاوبەشی، دەفەرموێت:

﴿وَلَوْ أَشْرَكُوا لَحَبِطَ عَنْهُمْ مَا كَانُوا يَعْمَلُونَ﴾[١]

واتە: گەر یەک شیرکیان ئەنجام بدایە (هەر جۆرێکیان بێـت) هەمـوو ئەو کارانەمان پووچ و بەتاڵ دەکردەوە کە دەیانکرد.

---

[١] - سورەتی الانعام، ئایەتی: (٨٨)

بەڵێ اللَّه تعالی ڕازی نیه بەو پەرستنەی تۆ کە بەو شێوەیە بیپەرستی و لەو لاشەوە لەسەر ڕێباز و بەرنامەی تری جگە لە ئیسلام بی، یان لەگەڵ شیرک و هاوبەشی کردنی هەر کەس و ڕێبازێک و شێخ و حیزب و فڵان و فیسارێک لەگەل اللَّه دا لە هەر بوارێک لەبوارەکانی عیبادەت و حوکم و ڕێباز و پشگیری و گوێڕایەڵی کردندا، ئەوە بزانە هیچ نرخێک بۆ کارەکانت دانانرێت و اللَّه تعالی قبوڵی ناکات، هەرچەند بە جوانی و دڵسۆزی ئەنجامی بدەیت بزانە ئەم هەڕەشەیەی اللَّه تعالی لە گشت پێغەمبەران کراوە بە پێغەمبەری خۆشەویستمانیشەوە ﷺ بەو هەموو کار و کردەوە و ئەزیەت و ئەشکەنجەیەی لە پێناو ئیسلامدا چەشتویەتی گشتی پوچەڵ دەکرد.

بۆیە ئاگاداربە کاروکردەوەت هەڵنەوەشێتەوە بەهۆی پشتیوانی و خۆشویستن و سەرخستنی بەرنامە و ڕێباز و کەسانێکی دوور لە دین، و لەبەرامبەریش اللَّه تعالی بپەرستی و بەخوای خۆتی بزانی، باهەر بڵێی من خواپەرستم دڵنیابە الله لێتی قبوڵ ناکات، بەڵکو اللَّه تعالی دەیەوێت هەر خۆی بەتاک و تەنها بپەرسترێ لە گشت ڕوویەکەوە پاک و بێگەرد ڕابگیرێت، چونکە سەرئەنجامی هاوبەش دانان و شیرک هۆکاری چوونە ئاگری دۆزەخ و بێبەش بوونتە لە بەهەشتی پڕ لە نازو نیعمەت.

## ٦ ئەم ئایەتە سەرنجی ڕاکێشام

ژیانی دونیا اللَّه تعالی بۆ تاقیکردنەوە دروستی کردووە، ئینجا ژیان تێیدا بردنە سەر کەم و کاتی و سنور دارە، کە تەمەن و ژیانی کەس نەزانراوە، بۆیە اللَّه تعالی پێغەمبەران (سەلامی اللَّـه تعالی لێ بێت) و بەرنامەی ناردووە تاکو مرۆڤەکان پێوە پابەندبن و بتوانن چۆن ژیانیان تێیدا ببەنە سەر، هەر بۆیە مرۆڤ ناتوانێ بێ بەرنامە ژیان لە دونیا بباتە سەر، تووشی سەرلێشواوی و گومڕابوون دەبێ، کە اللَّـه تعالی دونیای دروستکردووە، بەرنامە و پێغەمبەری بۆ ناردوون، تاکو لە وورد و درشتی گشت شتێک و حەڵاڵ و حەرامەکان مرۆڤەکان ئاگادار بکەنەوە.

بۆیە ئەگەر هاتوو مرۆڤ گوێڕایەڵی یاساو شەریعەتی الله عزوجل نەبوو، ڕێی گومڕای گرتە بەر دوای ئەوەی پێغەمبەری ﷺ بۆهات، ئیسلامی بۆهات، قورئانی بۆهات، ئەوە اللَّه تعالی لە دواڕۆژ ئاگری دۆزەخ دەکاتە پاداشتی، هیچ بیانو و عوزری بۆ نیە.

چونکە اللَّه تعالی هەموو بڕو بیانوی دەبڕی و پێ دەفەرمووێ، ئایە پێغەمبەرم ﷺ بۆ نەناردی؟ بەڵگەی ڕوون و ئاشکرام بۆ نەناردی؟ بۆچی باوەڕت نەهێنا و گوێدار نەبووی؟

﴿يَا مَعْشَرَ الْجِنِّ وَٱلْإِنسِ أَلَمْ يَأْتِكُمْ رُسُلٌ مِّنكُمْ يَقُصُّونَ عَلَيْكُمْ ءَايَٰتِي وَيُنذِرُونَكُمْ لِقَآءَ يَوْمِكُمْ هَٰذَا ۚ قَالُواْ شَهِدْنَا عَلَىٰٓ أَنفُسِنَا ۖ وَغَرَّتْهُمُ ٱلْحَيَوٰةُ ٱلدُّنْيَا وَشَهِدُواْ عَلَىٰٓ أَنفُسِهِمْ أَنَّهُمْ كَانُواْ كَٰفِرِينَ﴾[1] واتە: ئەی کۆمەڵی جنیی و ئادەمیی! مەگەر هەر لە خۆتان (لەئادەمی) چەند پەیامبەرێکتان بۆ نەهاتن ئایەت و نیشانەکانی منتان بۆ بخوێننەوە و لە گەیشتن و دیمەنانەی ئەم ڕۆژەتان بترسێنن کاتێ هیچیان بۆ نامێنێتەوە ئەڵێن: بەڵێ ئەی پەروەردگار! شایەتی لەسەر خۆمان ئەدەین: بەڵێ پێغەمبەرانی تۆ هاتن و، نامەکەشیان گەیاندپێمان ژیانی دونیا سەری لێشێواندن و هەڵی خەڵەتاندن و شایەتیان لەسەر خۆیاندا کە بەڕاستی کاتی خۆی بێ باوەڕ بوون.

بەڵێ ئیتر مرۆڤ لە دواڕۆژ شاهێدی ئەدات کە بەڵێ سەرپێچی کرد و گوێدار نەبوو بۆ فەرمانی اللَّه تعالی، بۆیە سەرنجام دۆزەخ و ئاگر دەبێتە شوێنی مانەوەی هەمیشەییان، پەنا بە اللَّه تعالی.

بۆیە براکەم بیزانە پێغەمبەرت بۆ هاتووە، قورئانت بۆ هاتووە، لە دواڕۆژ نەزانین عوزر نیە، تاکو زووە فریای خۆت بکەوە، خۆت شارەزای ئیسلام و تەوحید بکە، تاکو دووربی لە ڕێگای گومڕای و بەهەشت ببێتە پاداشتی نەبڕاوەت.



[1] - سورەتی الانعام، ئایەتی: (١٣٠)

## ٧ ئەم ئایەتە سەرنجی ڕاکێشام

ئــەبێ ئێمــەی موســڵمان جیــاوازبین لە کەســانی دونیــا پەرســت و شوێنکەوتوانی حەزو ئارەزوو، بیر بکەینەوە لەوەی ئەم ژیانەی دونیـا کە ئێستا تێیدا ئەژین و خەم و بێتاقەتی بۆ نەبوونی خۆشیەکانی دەرئەبـڕین، کە کاتی و کەمە و ئاگادار کراوینەتەوە لە قورئانی پیرۆز، هەر لەو کاتەی کە ئادەم پێغەمبەر (علیه السلام) بە فێڵ و تەڵەکەی شەیتان هەڵخەڵەتـا و خوای گەورە فەرمانی کرد لە بەهەشت بچـنە خـوارەوە بـۆ سـەر زەوی و پێـــی فەرمـــوون: ﴿وَلَكُمْ فِي ٱلْأَرْضِ مُسْتَقَرٌّ وَمَتَٰعٌ إِلَىٰ حِينٍ﴾[١]واتە: هـــەتا ماوەیەکیش جێ و شوێنی ژیان و مانەوەتان لە زەویدا بۆ هەیە.

سـەیر بـکەن اللَّـه جـل جـلاله فەرمـوویەتی: ﴿وَمَتَٰعٌ إِلَىٰ حِينٍ﴾ واتە: بـۆ ماوەیەک و کاتێکی دیاری نەکراو لە زەویدا بمێننەوە، هیچ ڕۆژ و مانـگ و ساڵێکی دیاری نەکردووە کە مانەوەی مرۆڤ لە فلانە ڕۆژ کۆتـایی پـێ دێت، نەخێر بەڵکو فەرموویەتی: بۆ ماوەیەک.

ڕەحمەتتان لێ بێت بزانن توخوا شەرم نـیە بە خۆمـان ئەڵێـین موسـڵمان و دژایەتی و ڕق و حەسوودی و خیانەت و ناپاکی بەرامبەر یەکتر بکەیـن،

[١] - سوڕەتی الاعراف، ئایەتی: (٢٤)

بۆمان دەرکەوت اللَّه تعالی فەرموویەتی: بۆ ماوەیەکی کەم و نەزانراو مانەوەتان بۆ هەیە، ئەوجا بیست، چل، حەفتا، هەشتا، ساڵە ئەوە نازانین چەندە، بەڵکوو کاتێکی کەمە و داهاتوومان هیچ دیار نیە، ئەبینین خزم و هاوڕێ و کەسە نزیکەکان بە جێمان ئەهێڵن، لە بەر چاومان یەکجاری وون ئەبن، ئەبێ ئاقڵ بین و ڕێگای ڕاست بەرنەدەین، چونکە بۆمان ڕوونکراوە و ئاگادار کراوین ژیانی دونیا مانەوەی کاتی و نەزانراوە لە چ ڕۆژ و کاتێکدا گیانمان تەسلیمی خوای گەورە دەکەینەوە، گرنگ ئێمەی مرۆڤ عوزر و بیانومان بۆ نەماوەتەوە، پێمان ڕاگەیندراوە ئەم ژیانەی دونیا کاتیە و ماوەیەک تێیدا ئەژین و ڕۆژێکیش دێ ئەمرن.
﴿قَالَ فِيهَا تَحْيَوْنَ وَفِيهَا تَمُوتُونَ وَمِنْهَا تُخْرَجُونَ﴾[1]، واتە: اللّـه تعالی فەرمووی: لەوێ دەژیین و لەوێش دەمرن و لەوێش دەردەهێنرێن بۆ وەرگرتنی پاداشت و تۆڵەی ڕۆژی حەشرتان.

کەوایە دونیایەکی ئاوا کاتی شەرمە و جێگای داخە بۆ کەسانێک کە خۆمان پێ بەندەی اللَّەیە و دژایەتی و دووبەرەکی لە نێوانمان هەبێ، شەرمە ڕەزیل و حەسوود بین لەگەڵ یەکتر، ئەوپەڕی جاهیلی و نەزانیە بەرگری لە کوفرو بێباوەڕی بکەین، بۆیە تاکو زووە با بەتەنها ببینە بەندەی اللَّەی خاوەن عەرش، تا سەرئەنجام بەهەشت دەبێتە شوێنمان.

---

[1] - سورەتی الاعراف، ئایەتی: (٢٥)

## ٨ ئەم ئایەتە سەرنجی ڕاکێشام

پێش هاتنی ئیسلام، مرۆڤایەتی لە ئەوپەڕی جاهیلی بوو، کەس خێرو خۆشی بۆیەک نەبوو، کەس لە کەس ئەمین و دڵنیا نەبوو، دزی، درۆ، زیندەبە چاڵکردنی کچان، و دەیان و سەدان خراپە دونیای ڕەشپۆش کردبوو.

بەڵام اللّٰە تعالی بە هۆی ئیسلامەوە ئیمانی خستە دڵی شوێنکەوتوانی و کردینی بە برا و یەک لاشە، بە جۆرێك مەودای دووری نێوان هەر یەکێك لەو کەسانە چەندان کیشوەر بێت، بەڵام فیکرو بیروباوەڕ و دڵیانی بەستەوە بە یەکتر و کردینی بە یەك جەستەو قەڵایەکی پۆڵاین بۆ یەکتر، و هۆگریی و تەبایی خستە نێوان دڵەکان.

بەڵێ ئەم ئیسلامە ڕەحمەت و بەختەوەری بوو بۆ مرۆڤایەتی ئەگەر فەزڵ و منەتی اللّٰە جل جلال نەبوایە کە دڵە ڕەق و وشکەکانی بە ئیمان زیندوو کردەوە و هەموو موسڵمانانی کرد بە برا، ئەوە پارە و هەموو سەروەتی دونیا بەخشرابا بۆ ئەوەی نموونەی برایەتیەکی یەك جەستەیی لەم شێوەیە دروست بووبا ئەوە دروست نە ئەبوون.

هەروەکو اللّٰە سبحانە و تعالی بیری ئیمانداران ئەهێنێتەوە ئەفەرموویێت:

﴿وَأَلَّفَ بَيْنَ قُلُوبِهِمْ لَوْ أَنفَقْتَ مَا فِي ٱلْأَرْضِ جَمِيعًا مَّآ أَلَّفْتَ بَيْنَ قُلُوبِهِمْ وَلَـٰكِنَّ ٱللَّهَ أَلَّفَ بَيْنَهُمْ﴾[1]

واتە: دڵەكانیشیانی بەست بەیەكەوە، ئەگەر هەرچی دارایـی زەوی هەیـە، هەر هەموویت خەرج بكردایە تا دڵەكانیانت پەیوەند بكردایە بـە یەكـەوە، ئەوە نەتدەتوانی ئەو دڵانە پەیوەست بكەیت بەیەكەوە، بەڵام الله (بەهۆی ئـاینی ئیسـلامەوە) خۆشـی و برایـەتی لـە نێوانیانـدا بـەرپاكرد، چونكـە بەڕاستی ئەو زاتە باڵادەست و دانایە.

بەڵێ الله تعالى ئەفەرمووێت: گەر هەر چی شت بـەخشرابـا، هـیچ كـات برایـەتیەك لـەم شـێوەیە دروسـت نـەدەبوو لەسـەر زەوی، بـەڵام بـەهۆی ڕەحمەت و بەخششی ئیمانەوە برایـەتیەك ئەخاتـە نێـو مرۆڤانێـك دوور و نزیك هیچ خزم و خوێنێك لە نێوانیان نەبوو، كەچی لە پێناو الله بۆ یەكتر خۆشیان ئەكەنە قوربانی.

ئەمەیە گەورەی بەرنامەی ئیسلام و ئیمان، كە چۆن دڵەكانی هۆگری یەكتر كرد و ئارامی و برایەتی خستە نێوان ڕەش و سـپی، هەژار و دەوڵەمەنـد، بچووک و گەورە، بەڵێ ئەمەیە گەورەی دەسەڵاتی خوای خاوەن عەرش.



[1] - سورەتی الانفال، ئایەتی: (٦٣)

## ٩ ئەم ئایەتە سەرنجی ڕاکێشام

الله تعالی کە ژیانی دونیـای دروسـت کـرد بـۆ تـاقیکردنەوە، ئینجـا دوو دەستەی لە مرۆڤەکان دیـاری کـرد، بەرەی حەق و بەرەی باتـل و پـوچ، کۆمەڵەی باوەڕدار و بێ باوەڕ، الله تعالی بەیەکتریان تاقی دەکاتەوە تـاکو حەق و ڕاستی و خوایەتی اللەی خاوەن عەرش دەربکەوێت کە پادشـا و دەسەڵاتداری گشـت بـوونەوەرە و هەر ئەو مـافی پەرسـتن و گـوێڕایەڵی کردنی بۆ هەیە، ئینجا الله تعالی دوو جێگا و شوێنی بۆ دیاری کـردوون، لە دواڕۆژ، بەهەشت بۆ باوەڕداران، و جەهەنەم و ئـاگری دۆزەخ بـۆ بـێ باوەڕان.

جیاوازییەکی زۆر هەیە لە نێوان باوەڕ و کـوفر لە دڵەکـان، سـبحان اللـه ئەوەندەی تێرامـاوم و بیـرم کـردۆتەوە ئـیمان و بـاوەڕ زۆر گەورەیە ئەگەر بەڕاستی لە دڵێک بچەسپێ ئەو دڵە وا لێدەکات لە هەرچی مرۆڤـی سـەر ڕووی زەوی نەترسێ، بەڵکو تاکە ترس لە دڵی تەنها ترسی الـلە تعـالی و سەرپێچی کردنی ئەوە، دەنـا لە هـیچ مـرۆڤ و خـاوەن هێـزە ناترسـێت، هۆکاری ئەم نەترسانەش بـاوەڕ و ئیمانـی بەهێـزە کە اللـە تعـالی لە دڵـی موسڵمانە ڕاستەقینەکان ئەچەسـپێنێ، ئەم ئـیمانە وا لەو کەسـە ئەکـات کە جگە الله تعالی هیچ کەس مردنی ئەوی بەدەست نیە، بۆیە ئەگەر سەیری

مێژووی ئیسلام بکەین ئەبینین کاتێک ئەهڵی حەق و ناحەق ڕووبەڕووی یەکتر بوونەتەوە هەمیشە کۆمەڵەی حەق سەرکەوتوونە بەسەر ئەهلی کوفر، گەرچی کوفر ژمارەی سوپا و هێزەکەی زۆرتر بووە، ئیمان وا لەو باوەڕدارە دەکات گیان فیدابێ بۆ سەرخستنی حەق و پەیامی ئیسلام. هەروەکو چۆن اللّه تعالى باس لە ئازایەتی و دلێری ئەهلی ئیمان دەکات و دەفەرموویێت: ﴿إِن يَكُن مِّنكُمْ عِشْرُونَ صَٰبِرُونَ يَغْلِبُوا۟ مِا۟ئَتَيْنِۚ وَإِن يَكُن مِّنكُم مِّا۟ئَةٌ يَغْلِبُوٓا۟ أَلْفًا مِّنَ ٱلَّذِينَ كَفَرُوا۟﴾[1] واتە: ئەگەر بیست کەسی خۆڕاگر هەبێت لە ئێوە، ئەوە زاڵ دەبن بەسەر دووسەد کەسدا، خۆ ئەگەر سەد کەس لە ئێوە هەبن، ئەوە بەسەر هەزار کەس لەوانەی کە بێ باوەڕن زاڵ دەبن. بۆیە هەرگیز مەترسن لە زۆری ژمارەی کوفر و کافران و لەوەی کەسانی بێ باوەڕ ببینن کە لوت بەرز و بەفیزن دڵنیابن لەکاتی ڕووبەڕووبوونەوەی ئەهلی ئیمان قاچەکانیان زەوی ناگرێ و ئەوەندە ترسنۆکن گیانیان لەسەر لوتیانە، چونکە دڵیان خالیە، لە ئیمان و باوەڕ بە اللّەی خاوەن عەرش. بۆیە پیاوی ڕووبەڕووبوونەوە نین بەرامبەر بە ئیمانداراە ڕاستەقینەکان، کەوابوو بیزانن سەرکەوتن و پایەداری تەنها بۆ اللّە تعالى پاشان پێغەمبەری ئازیز ﷺ و ئیماندارانە.

[1] - سورەتی الانفال، ئایەتی: (٦٥)

## ١٠ ئەم ئایەتە سەرنجی ڕاکێشام

مرۆڤ زۆر لاواز و بێدەسەڵاتە، بە لاواز بوونی دەماری دڵـی و جـگەر و گورچیلەکانی، ئەگەری مردنی بۆ هەمیشەیی هەیە، اللَّه تعالی بەم شێوەیە دروستی کردووە، ئینجا ژیان و مردن و لێـدانی دڵـی و تەواوی ژیـانی لە ژێر فەرمانی اللَّه تعالی دایە.

ئینجا موسڵمان لەم ڕاستیە تێگەیشتووە، کە هەموو شتێک لە زیان و چاکە بە ویسـتی اللَّـە تعـالی یە، بـۆیە لە گشـت کاروبـارێکی ژیانیـدا خـۆی تەسلیمی اللَّه تعالی دەکات، و بە جۆرێـک خـۆی ڕادەسـتی الـلە تعـالی دەکات، لە هیچ مرۆڤێک ناترسێ و حساب بۆ هـیچ شـتێک ناکـات، گەر اللَّه تعـالی وویسـتی چـاکەی بـۆت هەبـوو، خەڵکـی گشـتی دژت بـن و بیانەوێت زیانت پێ بگەیەنن، ئەوە هەرگیـز نـاتوانن، وە گەر اللَّـە تعـالی وویستی زیانێکت تووش بکات، ئەوە کەس ناتوانێ لای ببات لەسەرت.

﴿وَإِن يَمۡسَسۡكَ ٱللَّهُ بِضُرّٖ فَلَا كَاشِفَ لَهُۥٓ إِلَّا هُوَۖ وَإِن يُرِدۡكَ بِخَيۡرٖ فَلَا رَآدَّ لِفَضۡلِهِۦۚ يُصِيبُ بِهِۦ مَن يَشَآءُ مِنۡ عِبَادِهِۦۚ﴾[١]

---

[١] - سورەتی یونس ئایەتی: (١٠٧)

واتە: ئەگەر اللَّه تووشی ناخۆشی و زیانێکت بکات، ئەوە هیچ کەس ناتوانێت فریات بکەوێت و لەسەرتی لابەرێت جگە لەو زاتە، یاخود ئەگەر بیەوێت تووشی خێر و خۆشیەکت بکات، ئەوە هیچ کەس ناتوانێت بەری فەزڵ و بەخششی اللَّه بگرێت، هەر کام کە بیەوێت لە بەندەکانی بەهرەوەر دەکات لە نازو نیعمەتەکانی.

بۆیە گەر تۆ کچێکی ژێر کەوتۆتە دڵت و ترست هەیە لە دەستی بدەی، بەهۆی خەڵکەوە، بەڵام کە اللَّه ویستی لەسەر بێ بۆ تۆیە، ئەوە هەر بۆتۆ دەبێ دڵنیابە گەر هەموو خەڵکیش ڕێگربن، با شەو و ڕۆژ دژت بن و ڕێگر بن بێسوودە، چونکە کەس توانای ڕێگری نیە لە کاری اللَّە تعالی، یان هەر ئاوات و کاری تر، بۆیە هەرگیز نەکەی خەم لەهیچ شتێکی ژیان بخۆی گەر تۆ بەڕاستی و پاکی خۆت تەسلیمی اللَّه تعالی کردووە، دڵنیابە لە هەموو کاتە ناخۆشەکان سەرت دەخات، بەو مەرجەی تۆ بەندەیەکی ملکەچ و گوێڕایەڵ و سوڵحاو بی بۆ گشت فەرمانەکانی.

کەوابوو ڕەحمەتان لێ بێت، بیزانن هەر ئاوات و خەم و ناخۆشیەکت هەیە، دەتەوێ بۆت جێبەجێ بێ، دەتەوێ شیفات بۆبێ، قەرزەکانت بدەیەوە، ئەوە تەنها ڕوو لە اللَّەی خاوەن عەرش بکە، تاکو لە دونیا بەختەوەربی، و لە دواڕۆژ بەهەشت ببێتە پاداشتت.

## ١١ ئەم ئایەتە سەرنجی ڕاکێشام

دەبێ بزانین بەهەشت و دۆزەخ لە دوارۆژدا پاداشتن بۆ ئەهڵی ئیمان و کوفر، ژیانی دونیاش فرسەت و هەلێکە بۆ ئەوەی کارو کردەوەی تێدا بکەین، و بەدەم بانگەوازی ئیسلامەوە بچین، و لەو تەمەنە کەمەی بەشی هەر یەکێکمانە دەبێ ژیر و ئاقڵ بین بزانین لە پێناو چی و بۆچی ئەژین، بۆ ئەوەی لەدوارۆژ پەشیمان نەبینەوە، چونکە پەشیمان بوونەوە لە دوارۆژ بێسوودە، ئەوەتا اللَّه تعالی بیری مرۆڤەکان دەخاتەوە و دەهێنێتە پێش چاویان کە پاداشتی چاکەکاران لە دونیا بەهەشتە، وە ئەهڵی بێ باوەڕ و خراپەکارانیش دۆزەخە، ئینجا باسی ئەوە دەکات بۆ ڕزگار بوونی کافر و بێباوەڕان لە دۆزەخ دونیا و ئەوەندەی تری دونیاش ببەخشرێ سوودی نیە و ڕزگاریان نابێت، چونکە لە دونیا اللَّه تعالی پێغەمبەری بۆناردن قورئانی بۆ ناردن، بەڵام هەر گوێدار نەبوون سەرەڕای ئەوەی زۆرترین نازو نیعمەتی پێ بەخشین، لە هێز و لەش ساغی، بەڵام ئەوان لە دژایەتی ئیسلام بەکاریان هێنا، بۆیە دۆزەخ دەبێتە شوێنیان، پەنا بە اللَّه تعالی.

﴿لِلَّذِينَ ٱسْتَجَابُواْ لِرَبِّهِمُ ٱلْحُسْنَىٰ وَٱلَّذِينَ لَمْ يَسْتَجِيبُواْ لَهُۥ لَوْ أَنَّ لَهُم مَّا فِى ٱلْأَرْضِ جَمِيعًا وَمِثْلَهُۥ مَعَهُۥ لَٱفْتَدَوْاْ بِهِۦٓ أُوْلَـٰٓئِكَ لَهُمْ سُوٓءُ ٱلْحِسَابِ وَمَأْوَىٰهُمْ جَهَنَّمُ﴾[١]

[١] - سورەتی الرعد ئایەتی: (١٨)

واتە: بۆ ئەوانەی کە وەڵامی بانگێشتەکەی پەروەردگاریان دایەوە، لە ڕۆژی قیامەتدا پاداشتی چاکترو، بەهەشتیان بۆ هەیە و ئەوانەیش کە وەڵامی بانگهێشتەکەیان نەدایەوەو بڕوایان نەهێنا ئەگەر تەواوی ئەوەی لە زەوییدایە هی ئەوان بێت و ئەوەندەی تریشی لەگەڵ بێ هەموو بدەن بۆ ڕزگاربوونی خۆیان لە سزاو بیانەوێت خۆیان بکڕنەوە، دەیدەن و بەڵام لێیان وەرناگیرێ و ڕزگار نابن ئەوانە لە ڕۆژی دواییدا حیسابێکی سەختیان بۆ هەیە، و جێگاکەشیان دۆزەخە.

کەوابوو بیزانە تۆ ئێستا لە دونیایەکی کە هیچ نرخ و بەهایەکی نیە لە دواڕۆژ، بۆ ڕزگاربوونت لە ئاگر و سەختی دۆزەخ، ئەگەر تۆ بەندەیەکی ڕاستگۆ ئەهلی تەوحید نەبووی، دڵنیابە تەواوی دونیا زێڕ و ئەڵماس بێ لە دواڕۆژ سوودی بۆت نیە کە تەوحید ڕێبازت نەبوو، بۆیە بزانە ژیان کردن لەم دونیایە یەکجارە، کە مردی خۆرت بۆ هەمیشە ئاوا دەبێ، بۆیە نرخی کاتەکانی ژیانت بزانە و خۆت شارەزای ئیسلام بکە و بەڵێن بدە بە اللّـه تعالی کە ختوکە و لێدانی دڵ و گشت جوڵانەوەیەکت لە ژیان بۆ ڕەزامەندی ئەو بێت، تاکو بەهەشت دەبێتە شوێنی مانەوەی هەمیشەیت، بەئیزنی اللّە تعالی.



## ئەم ئایەتە سەرنجی ڕاکێشام ١٢

ئەبێ بزانین بەخشش و نازو نیعمەتەکانی دونیا گشتی اللّٰە تعالی بەخشیویەتی بە مرۆڤەکان، تاکو بتوانن ژیان لەدونیا بەسەر ببەن، بەخۆشی و ناخۆشیەوە، ئینجا دونیا و ئەوەی تێیدایە موڵکی اللّٰە تعالی یە و هەر ئەو خاوەنیەتی.

بۆیە مرۆڤ و بەتایبەت موسڵمان دەبێ زۆر شوکرانە بژێری اللّٰە تعالی بکات لەسەر نیعمەتەکانی، ئەوکاتە اللّٰە تعالی زیاتری بەسەر ئەڕێژێ و هەم دڵ و دەروونی ئارام و ئاسوودە ئەکات، بە جۆرێک کە وابزانێت دونیا هەموو هی ئەوە، بۆیە ئەگەر موسڵمان سوپاس گوزار بوو لەسەر خۆشی و ناخۆشیەکانی ئەوکات اللّٰە تعالی لەکاتی ناخۆشی و سەختیدا لەبیری ناکات و بەهانایەوە دێ، ڕزگاری ئەکات لەو سەختیەی بەسەری هاتووە، بۆیە نابێ خەم لە نەبوونی شتەکان بخوات کە ژنی نیە، و شووی نەکردووە، و سەیارەی نیە، یان نەخۆشە، موسڵمان دەبێ لە کاتی ناخۆشی و خەفەتی بەسەر دێ ئەبێ شوکربێ و ئارام گربێ، و لە ناخەوە پڕ بە دڵ سوپاسی اللّٰە بکات، کەسی نزیکی ئەمرێ ئارام بگرێ و ناشوکری و کوفرانەی اللّٰە تعالی ناکات، لە هەموو بارو زروفێک چاوەڕێی ڕەحم و میهرەبانی اللّٰە تعالی بکات، و یەقین و باوەڕێکی پتەوی هەیە بە خوایەکی خاوەن گشت بونەوەر لەو ناخۆشی و ئازارە ڕزگاری دەکات، و

ئاواتەكەی دێنێتە دیْ، هەر بۆیە اللَّـه تعالی بیری مرۆڤەكان دێنێتەوە بەوەی هەركەس سوپاس گوزارو شوكرانە بژێری نیعمەتەكانی بكات، زیاتری پیْ دەبەخشیْ و هەركەس سپلەو كوفرانەشی بكات، سزای دەدات. ﴿وَإِذْ تَأَذَّنَ رَبُّكُمْ لَئِن شَكَرْتُمْ لَأَزِيدَنَّكُمْ وَلَئِن كَفَرْتُمْ إِنَّ عَذَابِي لَشَدِيدٌ﴾[1] واتە: ئەو دەمە كە پەروەردگارتان پێتانی ڕاگەیاند كە: ئەگەر لەبەرامبەر نیعمەتەكانمەوە سوپاسگوزاریی بكەن، ئەوا منیش نیعمەت و بەخششی خۆمتان بۆ زیاد دەكەم خۆ ئەگەر بیْ باوەڕو سپڵەو پیْ نەزانبن ئەوا بەڕاستی سزام زۆر توندو سەختە، لەوانەیە ئەو هەموو نیعمەتانەتان لیْ وەرگرمەوە.

كەوابوو دوای هەر ناخۆشی و هەواڵێكی خەمناك، كەسی نزیكت لەدەست داوە، هاوسەرگیرییت نەكردووە، نەخۆشی و چاك نەبوویتەوە، هەژاری و پارەت نیە، هەرگیز بیْ هیوا مەبە و سوجدەیەكی سوپاس گوزاری بۆ اللَّهی خاوەن عەرەش ببە، لەسەر گشت ناخۆشیەك، ئەوكاتە دڵنیابە گەر یەك ڕۆژ لە تەمەنت مابیْ اللَّـه تعالی خۆشیەكی وادەخاتە ژیانت كە تەواوی خەمەكانت بیربچێتەوە، بۆیە لە ژیانت بڕیار بدە گشت كاتێك بەندەیەكی سوپاس گوزاربی بۆ ئەوەی لە دواڕۆژ یەكێك بی لە كاروانی نیشتەجیْ بوانی بەهەشتی پڕ لە نازو نیعمەت.

[1] - سوڕەتی ابراهیم ئایەتی: (٧)

## ١٣ ئەم ئایەتە سەرنجی ڕاکێشام

پاداشتی کاروکردەوەکانمان لە دوارۆژ بەهەشت و دۆزەخە، ئەو کارو کردەوانەی ئێستا ئەیکەین، بەچاک و خراپ، ئەگەر بە پێی فەرمانی قورئان و سوننەت نەبێت، تەنها ماندوبوون و بە هیلاک چوونە.
بۆیە دەبێ موسڵمان ژیر و ئاقڵ بێ، بۆ ڕۆژێک خۆی ئامادە بکات، کە هیچ کەس سوودی پێ ناگەیەنێت، هەموویان پاکانە بۆخۆیان دەکەن، کە لە دونیا کەسی باشبوون، بە خەیاڵی خۆیان ڕزگاریان دەبێ بەو پاکانەیە، هەروەکو چۆن ڕۆژی وەرگرتنی کارتی خوێندکاران دێت، هەموویان پێش وەرگرتنی ئەنجامەکان باسی تاقیکردنەوەکە ئەکەن، ئەڵێن زۆرمان خوێند، یان لە فڵان پرسیار خراپ بووین، ئینجا دڵنەوای خۆیان ئەکەن، بەڵام ئەو کەسەی خۆی ماندوو کردووە و خوێندویەتی بەبێ ترس و خەم چاوەڕێ ئەکات، بۆیە اللّٰە تعالى لەم ئایەتە بیری مرۆڤەکان دێنێتەوە، باسی ڕۆژی دوایی دەکات، کە چۆن هەموویان لەبەر سەختی ئەو ڕۆژە خەمیان هیچ کەسێ نیە، نە باوک، دایک، منداڵ، خێزان، بەڵکو تاکە خەمیان ڕزگار بوونی خۆیانە.

﴿يَوْمَ تَأْتِي كُلُّ نَفْسٍ تُجَادِلُ عَن نَّفْسِهَا وَتُوَفَّىٰ كُلُّ نَفْسٍ مَّا عَمِلَتْ وَهُمْ لَا يُظْلَمُونَ﴾[١]
واتە: رۆژێ دێ کە هەرکەس لەبیری خۆیدایەو دەمەقاڵێ و بەرگری لە خۆی دەکات، بۆ ڕزگارکردنی خۆی، واتە: لەبەر سەختیی ئەو ڕۆژەیە کەسی لەبیر نامێنێ و، جگە لە خۆیشی کەسێك نیە پشتیوانی لێ بکات هەموو کەسێکیش چی کردبێت بەڕێك و پێکی پاداش و تۆڵەکەی پێدەدرێتەوە و هیچ ستەمێکیشیان لێ ناکرێ.

کەوابوو ڕەحمەتت لێ بێت، تاکو لە ژیانی و نەمردووی تەوحید بکە ڕۆشنایی ڕێگاکەت و ئەم هەڵ و فرسەتە لە دەست مەدە بە کردنی کاروکردەوەی چاک و بەپێی قورئان و سوننەت، بۆ ئەوەی لە ڕۆژی دوایی یەکێک بی لەوانەی بەبێ ترس و خەم لەگەڵ کاروانی بەهەشتیان بەرەو فیردەوس هەنگاو دەنێن.



[١] - سورەتی النحل ئایەتی: (١١١)

## ١٤ ئەم ئایەتە سەرنجی ڕاکێشام

مرۆڤـی ژیـر ئەبـێ بە ئەقـڵ بیربکـاتەوە، بـۆ ناسـین و شـوێنکەوتنی بەرنـامەکەی، بزانێـت کـامە یاسـاو بەرنـامە چـاکە و بەخـتەوەری ئەوی تێدایە، شوێنی بکەوێت، چونکە هیچ کەس لە دونیا بـێ بەرنـامە نـیە، بـۆ ئەوەی بەخۆشی و بەختەوەری بژیت دەبێ شوێن بەرنامەیەک بکەویـت، تاکو ڕێنمونی بکات کەچۆن بژیت و ژیانی بەختەوەربێ.

بۆیە لە دونیا بە غەیری ڕێگای تەوحید هیچ ڕێگا و ڕێبازی تر نیە حەق و ڕاست بێ و بۆ مرۆڤایەتی مایەیی ڕەحمەت و بەختەوەری بێت، دەبێ بیـر بکەینەوە بزانین دونیا کێ دروستی کردووە؟ کـێ ئەم ئاسـمان و ئەسـتێرەو زەوی و گیاندار و حەشـەراتەی دروسـت کـردووە؟ بەبـێ گومـان بیـرت دەچێ بۆ لای اللَّەی خـاوەن عەرش، ئەڵێـی هەر ئەو دروسـتی کـردووە، کەوایە بۆچی شوێن یاسا و بەرنامەکەی دەستی مرۆڤ ئەکەوی و شـوێن ئیسلامەکەی اللَّە ناکەوی، بزانن اللَّە تعـالی چەنـد بەڕەحـم و سـۆزە بـۆ مرۆڤەکان، هەتا بۆیان ڕوون دەکاتەوە کە تـاکە ڕێگـا حەق و ڕاسـت بـێ تەنها تەوحید و ڕێگای ئیسلامە، بۆیە فەرمان بە پێغەمـبەری پێشـەوا ﷺ دەکات بە خەڵکی ڕابگەیەنێت، کە تەنها بەرنامەی ئیسـلام حەق و ڕاسـتە دەمێنێتەوە و گۆڕانکاری بەسـەر نـایەت تـاکو قیـامەت هەر شـوێنی ئەو

بـکەون، و دووربـن لە ڕێگـای بەتـاڵ و پـوچ، کە مـایەی ناخۆشـی و تێیاچوونە، ﴿وَقُلْ جَآءَ ٱلْحَقُّ وَزَهَقَ ٱلْبَٰطِلُ ۚ إِنَّ ٱلْبَٰطِلَ كَانَ زَهُوقًا﴾[1]

واتە: ئەی پێغەمبەر ﷺ بڵێ: تازە وا هەق و ڕاستی -کـە ئـایینی پیـرۆزی ئیسلامە- هات و دەرکەوت و بەتاڵ و پوچ و ناهەق و شیرك و بێ باوەڕیی هەڵوەشاو نەما دیارە کە باتڵ وکاری ناڕەوا، بەشی هەر تیاچوون و تـەفرو توونابوو و نەمانە.

بۆیە گەر تۆ ئەقڵ و بیر و هۆشت هەیە، ئەوە شوێن ڕێنموونی اللّٰه تعـالی پاشان پێغەمبەرەکەی ﷺ دەکەویـت، چـونکە اللّٰـه تعـالی ڕایگەیانـد کە تەنها ئیسلام ڕێبازی حەقە مـایەیی خۆشـگوزەرانیە بـۆ مـرۆڤ، کەوابـوو دەبێ موسڵمان شوێن ئەم حەقە بکەوێت کە لە قورئان و سوننەت هـاتووە، ڕێگاکەی بۆ هـیچ خۆشـی و ڕابـواردنێکی کـاتی دونیـا نەدۆڕێنـێ، تـاکو دەمرێ بەهەموو شێوەیەک لەسەر ئەم ڕێگایە دەمێنێـتەوە تـاکو سـەرنجام بەهەشت دەبێتە شوێنی مانەوەی یەکجاری.



[1] - سورەتی الاسراء، ئایەتی: (٨١)

## ١٥ ئەم ئایەتە سەرنجی ڕاکێشام

قورئان پریەتی لە پەند و بەسەرهات، بۆ ئەوەی مرۆڤ وانە و سوودی لێ وەرگرێت، و ڕێگای حەق بگرێتە بەر، هەر بۆیە اللّٰه عزوجل لە قورئان باسی ئەو چەن گەنجە ئیماندارە دەکات، کاتێک لە بەر پاشا و دارو دەستەکەی ئیمانی خۆیان دەشارنەوە، و ئەچن لە ئەشکەوت ئەمێننەوە، ئینجا کاتێک کە ئەخەون الله تعالی ئەم گەنجانە بۆ ماوەی (٣٠٠) ساڵ لە خەو ئەهێڵێتەوە، وەکو پەند و وانە بۆ نەوەکانی دوای خۆیان، ئینجا لە ئەشکەوتەکە وادەزانیت بەخەبەرن لە کاتێکدا بە خەوتویی ڕاکشاون، الله تعالی لاشەی گەنجەکان ئەم دیوو ئەو دیوی پێدەکرد و بەلای ڕاست و چەپیاندا هەڵی دەگێڕانەوە بۆ ئەوەی زەوی جەستەیان نەخوات و هەوای پاك لێیان بدات.

﴿ونُقلِّبُهُمْ ذاتَ اليَمينِ وذاتَ الشِّمَال﴾[١] واتە: ئەو خەوتووانە ئەم دیو و دیویان پێ دەکەین بۆ ئەوەی لاشەیان تێک نەچێت بەلای ڕاست و بە لای چەپدا.

---

[١] - سورەتی الکهف، ئایەتی: (١٨)

بۆیە بیزانە کاتێک تۆ بەڕاستی لە پێناو تەوحید و بیروباوەڕت تووشی دەیەها ناخۆشی و ئازار دەبی، نەک بۆ دونیاکەت، چەند گرنگە تۆ بۆ پارێزراوی تەوحید و ئیمانەکەت هەموو شتێکت قبوڵ بێت،

هەروەک چۆن دونیا ویستەکان هەموو شتێک قبوڵ دەکەن بۆ پارێزراوی دونیایەکەیان، لەو ساتانە، لە ناو ئەو هەڵوێستە زیندوو و زۆر بەرزانە دەچیتە ژێر ڕەحمەتی الله ەوە، ئەوکات الله تعالی لە ووردترین شتەکانی ژیانت چاودێریت دەکات.

خۆی ئاگای لێت دەبێ لە بچوکترینی جوڵەکانت، سەیربکە تەنانەت خۆی وات لێبکات لە کاتی خەوتوویش ئەم دیو و ئەو دیوت پێبکات، تاکو تۆ سەلامەت بیت، ئەی دەبێ لە شتەکانی تر چەندە چاوی لەسەرت بێت، دواتریش بێ ئەوەی هەستی پێبکەی و پێی بزانی بۆ ڕێزێکی زۆر گەورە ئامادەت دەکات!

ئەی ئەوانەی بە دوای گەورەیی دەگەڕێن تەوحید بکەن بە ئامانجی ژیانتان، چونکە گرنگترین سەرمایەی ژیانە ڕێگاکەتان، بانگەوازتان هەر هەمووی لە سەرەتا و بۆ هەمیشە تەرخان بکەن بۆ تەوحید و یەکخواپەرستی، دڵنیابن گەر وابکەن هەر ئێوە سەرکەوتوون.



## ١٦ ئەم ئایەتە سەرنجی ڕاکێشام

لە ژیـانی دونیـا زۆرجـار خەڵکانێـک دەبینـی، خـاوەن پشـت و هێـز و عەشـیرەتن، کەس نـاوێرێ بەچـاک و خـراپیش باسـیان بکـات، نەوەک تووشی کێشەیان ببێ و بیکوژن، چونکە عەشیرەتەکە گشتی لەسـەر یەک بە جواب دێن، بۆیە دەبنە ستەمکار و خاوەن بڕیار، هیچ کەسێک بۆی نیە بێ پرسی وان پێی بجـولێنێ، ئیـتر ئەمە ژیـانی دونیـاییە، لەدوای نەمـانی حوکمی ئیسلام یەکسانی و عەدالەت بـوونی نەمـا، جیـاوازی کەوتە نێـو مرۆڤـایەتی، خـاوەن عەشـیرەت و قەوم زاڵ بـوون بەسـەر خەڵـک، لە دادگاکان سکاڵا و شکایەتی مەزڵوم و هەژارەکان تۆزی لەسەر نیشتووە و کەس بە جواب نایەت لەسەریان و زوڵم و زۆرداری سەند، بەڵام زاڵـم و ستەم کار و خاوەن پشت و پەناکانی دونیا بەیەک ئاگادارکردنەوەی اللّـه تعالی گشت هێز و پشتیان تەفرو توانا دەبێ، ئەوەتا لە قورئانی پیرۆز اللّه تعالی بیری مرۆڤەکان دەخاتەوە، کە خۆشـی و ڕابـواردن و زوڵمەکانیـان تاکو سەر نیە و ئەگەڕێنەوە بۆ قیامەت بە تەنها و بێ کەس و پشت و پەنا یەک بە یەکیان بەرەو دادگای پڕ عەدالەت و یەکسانی اللّـە تعـالی بەڕێ دەکرێن، هەروەکو دەفەرمووێت:

﴿وَكُلُّهُمْ آتِيهِ يَوْمَ الْقِيَامَةِ فَرْدًا﴾[1] واتە: یەکە یەکەی ئەو خەڵکە بە تاك و تەنهایی دێت ئامادە دەکرێت لەبەردەم دادگای پڕ لە دادوەری اللّٰه تعالی.
بەڵێ ئەگەر لە دونیا لەکاتی تووش بوونت بە کێشە و ناخۆشی دڵت بە زۆری ژمارەی براو ئامۆزاو خزم و عەشیرەتت خۆشە، ئەوە بزانە لە دوارۆژدا بەتەنهای و بێ کەس و پشت و پەنا.
کەوابوو ئەی براکەم ڕەحمەتت لێ بێت با تاکە شت لە دونیا دڵت پێی خۆشبێ ئیمان و تەوحیدەکەت بێ، کە مایەی سەرفرازی تۆن و چوونە بەهەشتی پڕ لە نازو نیعمەتە، بۆیە بە تەنها بۆ ئەو بژی و بمرە...



[1] - سوڕەتی مریم ئایەتی: (٩٥)

## ١٧ ئەم ئایەتە سەرنجی ڕاکێشام

گەورەی ئیمان ئەوەیە مرۆڤەکان لە بەرزترین ئاستی گـومڕای دەگۆڕێـت، بۆ کەسێکی گوێڕایەڵ و ملکەچی فەرمانی اللـه تعـالی، ئـیمان بچێـتە هەر دڵێک، ئەو دڵە ئاوەدان و ڕووناک دەبێتەوە، ئەوەتا کاتێک موسا پێغەمبەر (علیه السلام) ڕووبەڕووی فیرعەون دەبێتەوە، تـاکو دەرکەوێـت کامەیـان لەسـەر حەق و ڕێبـازی ڕاسـتن، دارودەسـتە و خزمەتکـارانی فیـرعەون هەموو ساحیر و جادوکەرانیان کۆکردەوە.

پیان گـوتن: کە موسـا و هـارونی بـرای سـاحیر و فێلبـازن و دەیـانەوێ فیـرعەون و گەڵەکەی لەو شـارە دەربەدەر بـکەن، بـۆیە بەسـاحیرەکانیان گوت: هەمووتـان ببـنە یەک دەسـتە و ڕووبەڕووی موسـا (علـیه السـلام) ببنەوە، ئینجا کاتی ڕووبەروو بوونەوەیان جادوگەران گوتیان: ئـەی موسـا یان تۆ دەستبەکاربە و دار عەسای خـۆت فـڕێ بـدە، یـان ئێمـە سـەرەتا دەست پێ دەکەین و فڕێی دەدەین؟ ئینجا پێغەمبەر موسا (علـیه السـلام) فەرمووی: نەخێر ئێوە لە پێشدا دەست پێ بکەن، جا هەر دەستیان پێکـرد پەت و گوریس و دارەکانیان وا دەهێنرایـە بـەرچاوی خەڵـک وەک مـار بەخێرایی دەجوڵان بەهۆی جادوویانەوە.

پاشان پێغەمبەر موسا (علیه السلام) گۆچانەکەی (عساکه)فڕێی دەدات، بە فەرمانی اللَّه تعالی هەرچی ئەوان کردوویانە لەسحرو جادووەکە لوش و قووتی دەدات، ئەم کارەی موسا پێغەمبەر (علیه السلام) بەلای ساحیرەکانی فیرعەون جێگای شۆک دەبێ، و ئەم دیمەنە دەبێتە هۆی ئیمان هێنانیان بە اللَّەی خاوەن عەرش، کاتێک فیرعەون ساحیرەکانی دەبینێ بەبێ پرسی ئەو ئیمانیان هێنا، تووڕە دەبێ لێیان و فەرمان دەکات دەست و قاچیان بە پێچەوانە ببڕنەوە، و بە دارخورمایان هەڵواسن، بۆ ئەوەی سزایەکی بە ئازار ببینن، بەڵام ساحیرەکان ئیمان چۆتە قوڵای دڵ و ناخیان و حیساب بۆ قسەی فیرعەون ناکەن و لە هەڕەشە و سزای ناترسێن.

﴿قَالَ ءَامَنتُمْ لَهُۥ قَبْلَ أَنْ ءَاذَنَ لَكُمْ ۖ إِنَّهُۥ لَكَبِيرُكُمُ ٱلَّذِى عَلَّمَكُمُ ٱلسِّحْرَ ۖ فَلَأُقَطِّعَنَّ أَيْدِيَكُمْ وَأَرْجُلَكُم مِّنْ خِلَٰفٍ وَلَأُصَلِّبَنَّكُمْ فِى جُذُوعِ ٱلنَّخْلِ وَلَتَعْلَمُنَّ أَيُّنَآ أَشَدُّ عَذَابًا وَأَبْقَىٰ﴾[١] واتە: فیرعەون گوتی: ئایا ئێوە هەر ئاوا باوەڕتان پێ هێنا پێش ئەوەی مۆڵەتتان بدەم و ڕازی بم؟ بەڕاستی دیارە موسا گەورە و مامۆستاتانە و هەر ئەو فێری جادووگەری کردوون، شەرت بێت دەست و قاچتان بە پێچەوانەوە بقرتێنم و هەڵتانواسم بەقەدی دارخورمادا ئەوسا چاک دەزانن کە کامان (من، یان خوای موسا) سزامان توندو تیژو بەردەوامە!

[١] - سوڕەتی طه، ئایەتی: (٧١)

بەڵـێ ئەمە گەورەی ئـیمان دەردەخـات کە پێشـتر چـۆن جـادوگەران خزمەتکار و کۆیلـەی فیـرعەون بـوون و خەڵکیـان چەواشـە دەکـرد، بـۆ فیرعەون و ڕێگای گومڕای، بەڵام کاتێک ڕاستیەکانیان بۆ ڕوون بـوویەوە و ئیمانیان هێنا بە اللّٰەی خاوەن عەرش، لە هیچ سزاو ئازارێک نەترسـان، و بە فیرعەونیان گوت: چیت لەدەست دێت ئەنجامی بدە و کەمتر خـەمی مەکە، بەڕاستی تۆ هەر دەتوانیت ژیانی ئەم دونیایەمان لێ زەوت بکەیت، بەڵام توانـات بەسـەر ژیـانی دوارۆژ نـیە، ئـەم ئازایەتیـەی جـادوگەران، هۆکاری ئەوە بوو شرینی ئیمان تێکەڵـی ڕووحیـان بووبـوو، بـۆیە لە هـیچ سزایەکی فیرعەون نەترسـان، ئەمەیە گەورەی ئـیمان مرۆڤەکـان لەو پەڕی خراپە و زووڵم و زۆرداری دەکاتە کەسێکی میهرەبان و بەسۆز، کەوابـوو هەمیشە داوای سەلامەتی ئیمان و بەردەوام بوون لەسـەر تەوحیـد لە اللّٰـە تعالی بکە.



## ١٨ ئەم ئایەتە سەرنجی ڕاکێشام

اللَّه عزوجل لەم ئایەتە پیرۆزە بیری مرۆڤەکان دەهێنێتەوە، کە ئەم ژیانەی ئێستا تێیدان، لە ڕابواردن و خۆشی هەڵاو بەزمەکان بۆ هەمیشـەیی نـین، بەڵکو دەرگایەکمان لە پێشە کە، هەموو کەس دەبـێ پێیـدا تێـپەر بێـت و، ڕزگار بوون تێیدا مەحاڵە و ئەبێت ڕۆژێـک بەناچـاری ڕێـی ئەو دەرگـایە بگری و گیانت لە لاشەت جیا ببێتەوە، ئەوەتا اللَّـە تعـالی بە پێغەمـبەری ئازیز ﷺ ئەفەرمووێت و بیری مرۆڤەکان دێنێتەوە، کە هیچ کەس لەپێش پێغەمبەری پێشەوا ﷺ بۆ هەمیشە لە ژیان نەمـاوەتەوە، بـۆیە اللَّـە تعـالی دەفەرمووێ: ئەی پێغەمبەر ﷺ ئەگەر تۆ بمریت و دوای وەفاتت ئایە ئەو خەڵکە بەڕێزترن و گەورەترن کە  نەمرن و بۆ هەمیشە لە دونیا بمێننەوە!

﴿وَمَا جَعَلۡنَا لِبَشَرٖ مِّن قَبۡلِكَ ٱلۡخُلۡدَۖ أَفَإِيْن مِّتَّ فَهُمُ ٱلۡخَٰلِدُونَ﴾[1]

واتە: ئێمـە پـێش تـۆ ژیـانی هەمیشـەیی و نـەمریمان بـە هـیچ کەسـێک نەبەخشیووە، جا ئایا ئەگـەر تـۆ بمریـت، (دوای مـەرگی تـۆ) ئـەوە ئـەو خەڵکە ژیانی هەمیشەیی دەبەنەسەر و نامرن؟!

[1] - سورەتی الانبیاء، ئایەتی: (٣٤)

بێگومان نەخێر دونیا بۆ پێغەمبەران نەبوو چۆن بۆ هەمیشە بۆ ئێمەی تاوانبار ئەبێت؟!

بۆیە گەر لە خۆشترین کات و سەفرە و ڕابواردن بوویت، با نەفست لە بیرێ نەچێ و بەو خۆشیانە هەڵنەخەڵەتێ کە تێیدایە و با بزانێ گشتی کاتی و بڕاوەیە، کەوابوو با هەمیشە بەندەی اللَّـه تعالى بین و بۆ ڕەزامەندی ئەو تێ بکۆشین، تاکو سەرنجام بەهەشت دەبێتە شوێنی مانەوەی هەمیشەیمان.



## ئەم ئایەتە سەرنجی ڕاکێشام ١٩

حەق ڕاست و ڕوونە و هەرگیز مەیلی بۆ خواری و زوڵم و خراپە نیە و چەسپاو کاملە لە گشت ڕوویەکەوە، ئینجا ئەو حەق و ڕاستە ڕێبازی ئیسلامە، کە تاکو قیامەت ناگۆڕێ و هەردەمێنێ، چونکە اللەی خاوەن عەرش خاوەنیەتی، لە بەرامبەر حەق و ڕاستی ناحەق و بەتاڵ و پوچ هەیە، کە حەز و ئارەزووی مرۆڤە گومڕاکانە، اللّٰه تعالى حەق و ڕاستی بۆ موسڵمانان کردۆتە بەرنامە کە پابەندبوون پێیەوە مایەیی سەرفرازی و بەختەوەریانە، لە دونیا و دواڕۆژ، حەق ڕاست و ڕوونە و دادوەر و عادلە باشترین یاسایە بۆ مرۆڤایەتی، بەڵام ناحەق و پوچ ئارەزووی نەفسی مرۆڤە گومڕاکانە دژ بە حەق و شەریعەتی اللە تعالى تێدەکۆشێ، حەق بەرامبەر ناحەق هەمیشە لە سەرکەوتنە، بەڵام ناحەق ئارەزووی نەفسی مرۆڤی بێ دەسەڵاتە. بۆیە بەردەوام کێشە بۆ ئاژاوە دروست دەبێ، کوشتن، زووڵم، غەدر، تاوان، هەرچی ناخۆشی و نەهامەتی دونیا هەیە گشتی بەهۆی ناحەق و یاسای دەستی مرۆڤەکانە، هەر بۆیە اللّٰە تعالى لەم ئایەتەی قورئان بۆ نیشاندانی بەڵگەی بەهێزی حەق و پوچی ناحەق بیری مرۆڤەکان دەبا بۆ شوێنکەوتنی حەق و پشتکردن لە ناحەق و پوچ، گەر حەق و ڕاستی شوێن ناحەق و ئارەزووی مرۆڤە بێباوەڕەکان کەوتبا،

ئەوکاتە گشت شتێک تێک ئەچوو زەوی پڕ دەبوو لە خراپە و تاوان ئیتر شتێک نەئەما بەناوی ژیان، هەروەکو فەرموویەتی: ﴿وَلَوِ ٱتَّبَعَ ٱلۡحَقُّ أَهۡوَآءَهُمۡ لَفَسَدَتِ ٱلسَّمَٰوَٰتُ وَٱلۡأَرۡضُ وَمَن فِيهِنَّۚ بَلۡ أَتَيۡنَٰهُم بِذِكۡرِهِمۡ فَهُمۡ عَن ذِكۡرِهِم مُّعۡرِضُونَ﴾[1] واتە: ئەگەر حەق و ڕاستی دوای هەواو ئارەزووی ئەوان کەوتبا، چۆنیان پێخۆشبا، هەق ئاوا بووبا بێگومان ئێستا سیستەمی ئاسمانەکان و زەوی و هەر دروستکراوێکیتریش تیایاندایە، دەشێواو تێکدەچوو، چونکە بوونەوەر لەسەر بناغەی دادپەروەریی و دادگەریی دامەزراوە، نەك بە ئارەزووی ئەوان بێت، چونکە هەندێ شت هەرچەند ناهەقی و ستەمیش بێت هەر بەلای ئەوانەوە حەقە! کەچی ئەوان لەوە ڕوو وەردەگێڕن. ئێستاکەش لە پاش نەمانی حوکمی ئیسلام و زاڵ بوونی ناحەق و پوچ و یاسای دەسکردی گومڕاکان ژیانی مرۆڤایەتیان پڕکردووە لە کێشە و ناخۆشی و کوشتن، هەژاری و برسیەتی، چونکە کەسانی زاڵم و ستەمکار دەستیان گرتووە بەسەر خۆشیەکان، گشت شتێکیان داگیر کردووە، ئەمەش ئەوپەڕی ناحەقی و خراپەکاریە، بەڵام حەق و ڕاستی و شەریعەتی ئیسلام مایەی ڕەحمەت و میهرەبانین بۆ تەواوی دروستکراوان، بۆیە گەر خۆشبەختی و ئاسوودەیتان دەوێ تەنها شوێن حەق و پەیامی تەوحید بکەون، دڵنیابن سەرفراز دەبن لە دونیا و دواڕۆژ.

---

[1] - سورەتی المومینون ئایەتی: (٧١)

## ئەم ئايەتە سەرنجی ڕاكێشام ٢٠

مرۆڤەكان كە خۆيان بە موسڵمان دەزانـن، ئەوانەن كە تەسـليمی حـوكم و فەرمانی اللَّه تعالى پاشان پێغەمبەرەكەی ﷺ دەبێت.

ئينجا ئەو موسـڵمانە دەگەڕێـت بەدوای حـوكمی اللَّـە تعـالى و ڕێنمـونی رەسولەكەی ﷺ، كاتێك فەتوايەكی بوێت لەهەر مەسـەلەيەكی دينيـدا، بە نموونەی پاک و خاوێنی و نوێژ و ڕۆژوو و حەج و زەكـات، حيجـاب و باڵاپۆشی يان كاروبارێک و بابەتێک كە پەيوەندی بە شەرعەوە هەيە، ئەم فەتوايەی وەردەگرێت كە بەڵگەی قورئان و سوننەتن، نەك لەخۆيەوە و بە پێ حـەزی خـۆی كـارەكە بكـات، بەڵكـوو دەگەڕێـت بەدوای ڕێنمـونی پێغەمبەرەكەی ﷺ و پرسياری لەبارەوە دەكات، جا كاتێـك پێـی گەيشـت دەسـتی پێـوە دەگرێـت و كـاری پێـدەكات و دەيكـاتە نـور و ڕوونـاكی چاوەكانی هەرچەندە هەرچی مرۆڤـی سـەر زەوی هەيە دژايەتـی بكـات، ئـەو هەرگيـز گـوێ بە قسـەی ئەهلـی فەسـاد و ئەهلـی هەواو ئـارەزوو ناگرێت، چونكە ئيمانداری ڕاستگۆ كاتێك پێيان گوت اللَّـە تعـالى پاشـان پێغەمبەرەكەی ﷺ وا دەفەرمووێت يەكسـەر ئەڵێـت: چـی يـانی خـوای گـەورە پاشـان پێغەمـبەرەكەی ﷺ وای فەرمـووە؟ بەڵـێ وای فەرمـووە يەكسەر دڵی ڕائەچەلكێ ئەڵێت: تەواو بيستم و گوێرايەڵ بووم،

ئایا هەرگیز اللَّە تعالی ئەمری پێکردووین کە جگە لە رسول اللَّە ﷺ پابەندی قسەی هیچ کەسێکی تر بین؟!

نا بە گەورەیی اللَّە کە پێغەمبەری ﷺ بەحەق ناردوە، بەڵکو فەرموویەتی:
**﴿إِنَّمَا كَانَ قَوْلَ ٱلْمُؤْمِنِينَ إِذَا دُعُوٓا إِلَى ٱللَّهِ وَرَسُولِهِۦ لِيَحْكُمَ بَيْنَهُمْ أَن يَقُولُوا سَمِعْنَا وَأَطَعْنَا وَأُولَـٰٓئِكَ هُمُ ٱلْمُفْلِحُونَ﴾**[1]

واتە: کاتێ بانگی بڕوادارەکان دەکرێن بۆلای فەرمانی خوای گەورە پاشان پێغەمبەرەکەی ﷺ بۆ ئەوەی لە نێوانیاندا داوەری بکا هەر ئەمەیە کە ئەڵێن: بیستمان و گوێڕایەڵین بۆ هەموو فەرمانێکیان، هەر ئەوانەشن سەرفرازو سەرکەوتوو.

جا گەر تۆ ڕاستیت دەوێت ئەوە باش بزانە کە لە دینەکەتدا یان تەنها و تەنها شوێنکەوتەی اللە تعالی پاشان رسول اللە ﷺ دەبیت یان شوێنکەوتەی فلان و فیسار و گروپ و شێخە دەبیت، ئینجا بەهەشت یان ئاگری دۆزەخ، بە شوێنکەوتن و گوێڕایەڵیت بۆ قورئان و سوننەت یان پشت کردنت لێیان هەڵبژێرە.



[1] - سورەتی النور، ئایەتی: (٥١)

## ئەم ئایەتە سەرنجی ڕاکێشام ٢١

اللَّه تعالی کە مرۆڤەکانی دروست کردووە، گشتی لەیەک توخم و مادە هێناوەتە بوون، هیچ کەس جیاوازی نیە بەسەر ئەوەی تر، هەموومان لە خوێن و ئێسقان و پاشەڕۆ پێک هاتووین، بۆیە ئەگەر لە دونیا خاوەنی هەر پلەو پایەک بووین نابێ خۆمان لێ بگۆڕێ و فیز و کیبر بکەین بەسەر خەڵکی، ئەوەتا پێغەمبەری اللَّه سولەیمان (علیه السلام) بەو هەموو دەسەڵاتەیەوە کە اللَّه تعالی پێی بەخشی بوو، کە جن و ئاژەڵ و باڵندەی لە ژێر دەستی بوو، زمانی هەموویانی دەزانی و لێیان تێدەگەیشت، بزانە کاتێك نامە دەنووسێت بۆ شاژنە موشریکەکە چی تێیدا دەنووسێت:

﴿إِنَّهُۥ مِن سُلَيۡمَـٰنَ وَإِنَّهُۥ بِسۡمِ ٱللَّهِ ٱلرَّحۡمَـٰنِ ٱلرَّحِيمِ﴾[١] ، واتە:

بێگومان نامەکە لە سولەیمانەوەیە و بە ناوی خوای بەخشندەی میهرەبانەوە.

ڕەحمەتت لێ بێت سەیری ئەم بڕگەیە بکە ﴿إِنَّهُۥ مِن سُلَيۡمَـٰنَ﴾ تەنها ناوی خۆی بەبێ هیچ لەقەب و پلەیەك!!

لە نامەکەدا نا نووسێت: لە سولەیمان پێغەمبەری خواوە بۆ ...!

[١] - سورەتی النمل ئایەتی: (٣٠)

لە سولەیمان پاشاوە بۆ...!

کەچی بەداخەوە ئێستا کابرا دوو دێر پێشەکی بۆ کتێبێك دەنووسێت، شەش دێر باس لە عەشیرەت و قەوم و دکتۆرا و پرۆفیسۆریەتی و سەرۆك بەشی فڵان زانکۆ و وانە بێژ لە فیسار زانکۆ و مۆڵەت پێدراو لە فڵان زانستدا و.....هتد دەکات!!!!

بۆیە گرنگ نیە بۆ موسڵمانی ژیر و ئاقڵ نازناو و لەقب و بڕوانامە و ناوبانگ ئەوەی گرنگە تەنها بەندەی اللَّه تعالی بیت و بەس ئەوەی تر هەموو بێسوودە.

کەوابوو نەکەی هەڵبخەڵەتی لەم ژیانە کەمە و کاتیە بەردەوام بەندەی اللَّه تعالی بە، بە هیچ شێوەیەک دین و عەقیدە و بیروباوەڕت نەدۆڕێنی بۆ دونیایەکی کاتی، تاکو بە ئیزنی اللَّه لە دوارۆژ بەهەشتی فیردەوس شوێن و مەکانت بێت.



## ئەم ئایەتە سەرنجی ڕاکێشام ٢٢

کافر و موشریکانی قورەیش نکۆڵیان لەوە نەدەکرد کە دینی ئیسلام هیدایەت و ڕێنیشاندەرە، بەڵکو دەترسان لەوەی کە ئیمان بهێنن و واز لەبت و خودا پووچەکانیان بهێنن، ئەوکات خەڵکی بدات بەسەریاندا، تووشی مردن و لەناوچوون ببنەوە، و خۆشی دونیا لەدەست بدەن، بەڵام اللَّه یان لە بیر چووبویەوە وە بەڕاستی ئیمان تێکەڵی دڵیان نەبوو بوو نەشچووبوو ناوی، ئەگەر چووبایە ناوی ئەوا بیروباوەڕیان دەگۆڕاو دەیانزانی کە ئەمن و ئەمان تەنها لە لای اللَّـه تعالی یە هەروەکو چۆن حەرەمی مەککەی بۆ پاراستوون ڕزقی لە هەموو شوێنێکەوە بۆ دەناردن.

هەر وەکو اللَّه تعالی دەفەرمووێت: ﴿وَقَالُوا إِنْ نَتَّبِعِ الْهُدَى مَعَكَ نُتَخَطَّفْ مِنْ أَرْضِنَا أَوَلَمْ نُمَكِّنْ لَهُمْ حَرَمًا آمِنًا يُجْبَى إِلَيْهِ ثَمَرَاتُ كُلِّ شَيْءٍ رِزْقًا مِنْ لَدُنَّا وَلَكِنَّ أَكْثَرَهُمْ لا يَعْلَمُونَ﴾[1] واتە: بت پەرستەکانی مەککە گوتیان: ئەگەر پەیڕەوی لە دینەکەی تۆ بکەین ئەوا لەسەر ئەم زەویی و ناوچەی خۆمانەدا دەڕفێنرێین ئەی ئێمە ئەوانمان لە حەرەمێکی هێمن و ئارامدا جێ نەکردۆتەوە لەم کاتی بێ بڕواییەیاندا ئیدی ئەگەر شوێن ئاینی پێغەمبەر

[1] - سورەتی القصص، ئایەتی ٥٧

ﷺ بکەون چۆن دەفرێنرێن جۆرەها بەرووبوومی بۆ کۆ ئەکرێتەوەو بـۆی ئەهێنرێ، ئەوە هەموویشی ڕزق و ڕۆزییە لە لایەن ئێمەوە لـەو جێگـا بـێ دەرامەتەدا بۆیان دێت، بەڵام زۆربەیان ئەم ڕاستییە نازانن.

بە هەمان شێوە ئەمرۆ خەڵکـی بـە گشـتی دەزانـن کـە قورئـان و ئیسـلام هیدایەتن، بەڵام دەترسن گـەر دەسـت بگـرن بـە شـەریعەت و حـوکم و یاساکانی ئیسلامەوە وازبهێنن لـە عەلمانیـەکان وڵاتـانی بـێ بـاوەڕ بـدەن بەسەریان دا و بیانکوژن و ڕزق و ڕۆزیان ببرن، هـەموو ئەمـەش بـەهۆی ئەوەیە کە ئیمان تێکەڵی دڵیان نەبووە و نەچۆتە ناوی ئەگەر نـا دەیـانزانی کە عیزەت و کەرامەت و ڕزق و رۆزی لە پەنای دینی اللَّه تعالی دایە.



## ئەم ئایەتە سەرنجی ڕاکێشام ٢٣

لە ژیانی دونیا مانەوەی مرۆڤەکان تێیدا بۆ ماوەیەکی کـاتی و نەزانـراوە، هەرچی شتە لە دونیاش لە دەوڵەمەندی، جوانی و هێـز، تەمەن، گەنجـی، و تەواوی خۆشـیەکان گشـتی دەڕوا و نـامێننەوە، کـاتین، و هیچـی هـی خۆمان نیە، تەنانەت خوێن و ئێسقان و هەتا ئەو هەناسـەی هەڵیـدەمژین هی خۆمان نیە دوای هەڵمژین فڕێی دەدەینەوە.

ئەوەی لەپێنـاوی هـاتووینەتە دونیـا تەنهـا تەوحیـد و بەحەق پەرسـتنی اللّٰهی خاوەن عەرشە، بۆئەوەی لەو بارەیەوە تاقی بکرێینەوە، کە بەڕاستی بەندایەتی بۆ اللّٰه تعـالی ئەکەیـن، یـان خۆشـی و نـازو نـیعمەتە بـڕاوە و کاتیەکەی دونیا هەڵمان دەخەڵەتێنێ لە پەرستنی اللّٰه تعالی.

هەروەکو اللّٰه تعـالی لەم بـارەیەوە دەفەرمـووێ: ﴿وَمَآ أُوتِيتُم مِّن شَىْءٍ فَمَتَٰعُ ٱلْحَيَوٰةِ ٱلدُّنْيَا وَزِينَتُهَا ۚ وَمَا عِندَ ٱللَّهِ خَيْرٌ وَأَبْقَىٰٓ ۚ أَفَلَا تَعْقِلُونَ﴾[١] واتە: وە هـــەر شتێکتان پێ بەخشراوە لە ماڵ و ژن و منداڵ و کاڵاو خۆشیی و جـوانیی ژیـانی ئـەم دونیاییـە کـاتیە و دەڕوا وە ئـەوەی لای خوایـە چـاکترو هەمیشەترە بۆتان دە ئایا لەوەش تێناگەن و ژیر نابن؟!

---

[١] - سورەتی القصص، ئایەتی: ٦٠

خۆشبەختی بۆ ئەو کەسەی کە بە دونیاو خۆشیەکانی هەڵناخەڵەتێ بۆ ساتێکی کەمیش اللَّه تعالی لە بیرناکات، دونیا و ڕابواردنەکانی لە پێش چاوی هیچ نییە و هەوڵ بۆ بەدەست هێنانی بەهەشت ئەدات، ئەگەر هاتوو ماڵی دونیاشی هەبێت بۆ خزمەتی ئیسلام بەکاری دێنێت و دەیکاتە قوربانی، کەوابوو بۆمان ڕوون بوویەوە و دەرکەوت ژیانمان لەو پەڕی خۆشی بێ، بێسوودە، گەر بەڕاستی تەوحید ڕێبازمان نەبێ، چونکە هەرچۆن بێ ئەبێ بزانین ئەم ژیانە ماڵی هەمیشەیمان نیە و ڕۆژێک ئەبێ بەجێ بێڵین، خۆشبەحاڵی ئەو بەندەیەیی هەموو خەم و تێکۆشان و هەوڵی لە ژیان بۆ بەدەست هێنانی بەهەشتە.



## ٢٤ ئەم ئایەتە سەرنجی ڕاکێشام

اللَّه تعالى زۆرترین نـیعمەت و بەخششـی لە دونیـا بە مـرۆڤ بەخشـیوە، تاکو پەرستش و عیبادەت بە تەنها بۆ ئەو ئەنجام بـدەن و دووربـکەونەوە لە هەموو خوایەکی بەتال و پوچ و ئیسلامیش بەرنامە و یاسایان بێت.

یەکێک لەو نیعمەتە گەورانەی اللَّه تعالى بریتیە لە بوونی ڕۆژ و شەو، کە ڕۆژ بۆ کـارکردن و پەیـداکردنی پـارە و ڕزق و ڕۆزیە، تـاکو بە ژیـانێکی سـەربەرزانە بـژی، و چاوشـۆری کەس نەبـی، وە شەویشـی دانـاوە بـۆ ئیسراحەت و خەوتن، کە ئەم دوو نـیعمەتەی اللَّـە تعـالى کەس نـاتوانێ کاتەکانیان بگۆڕێت و پاش و پێشیان پێ بکات و شـەو بێنێـتە نـاو ڕۆژ و ڕۆژیش بباتە ناو شەو، بەڵکو لەکاتی دیاری کراو کە اللَّه تعـالى بڕیـاری لێدەدات دەبێتە ڕۆژ و شەو.

بۆیە لەم ئایەتە اللَّه تعالى بە پێغەمبەری پێشەوا ﷺ دەفەرموویت:

بەو خەڵکە ڕابگەیـەنێ: ئەگـەر لەسـەر زەوی ڕۆژی نـەمێنی واتـە تـەنها شەوی تاریك بێ کێ هەیە ڕۆژی ڕووناکتان بۆ بێنێتەوە؟

﴿قُلْ أَرَأَيْتُمْ إِن جَعَلَ اللَّهُ عَلَيْكُمُ اللَّيْلَ سَرْمَدًا إِلَىٰ يَوْمِ الْقِيَامَةِ مَنْ إِلَٰهٌ غَيْرُ اللَّهِ يَأْتِيكُم بِضِيَاءٍ أَفَلَا تَسْمَعُونَ﴾[1] واتە: ئەی پێغەمبەر ﷺ پێیان بڵێ: خەڵکینە هەواڵم بدەنێ ئەگەر اللَّه شەوگار بکات بە هەمیشەیی تا ڕۆژی قیامەت (هەر ڕۆژ نەبێتەوە) چ خوایەکی تر هەیە جگە لە اللَّه بتوانێت ڕووناکیتان بۆ فەراهەم بهێنێت، ئایە ئێوە ئەم ڕاستیانە نابیسن؟!

اللَّه تعالى بۆیە ئەم پرسیارە ڕووبەڕووی مرۆڤەکان دەکاتەوە تاکو بیر لە گەورەی بکەنەوە و تەنها بەندەی ئەوبن، چونکە ڕوونە ئەم بڕیارەی ڕۆژ و شەو بەدەست مرۆڤ نیە.

کەوابوو تۆی مرۆڤ کە خۆت دروست کراوی اللَّه تعالى یت، تا کەی دژایەتی بەرنامەی ئیسلام و موسڵمانان ئەکەی، تاکو کەی بێ فەرمانی اللَّه تعالى ئەکەیت، بیزانە دونیا هی ئێوە نیە بەیانی بەجێی دێڵن، بۆچی بەئاگا نایەیتەوە سەیری زاڵم و خراپەکارانی پێش خۆتان کردووە چیان بەسەرهات؟ لە کاتێکدا خۆیان کردبوو بەخوا پەنا بە اللَّه تعالى هێزو دەسەڵاتی زۆریان هەبوو گشتی تەفروتونا بوو لەناو چوون.

بۆیە تاکو زووە تەسلیمی بەرنامەی اللَّه تعالى بە و ببە بەندەیەکی گوێڕایەڵ تاکو سەرئەنجام بەهەشت دەبێتە شوێنی مانەوەی هەمیشەیت...

---

[1] - سوڕەتی القصص ئایەتی: (٧١)

## ئەم ئایەتە سەرنجی ڕاکێشام ٢٥

ژیان لە کات و ساتێک ناوەستێت، کە بەردەوام لە خۆشی یان ناخۆشی بێت، بەڵکو گشت شتێکی کاتیە، و هیچی تاکو سەر نیە، بۆیە گرنگترین شت بۆ موسڵمان هەموو کات بەندەیەکی ملکەچ و گوێڕایەڵی اللَّه تعالی بێ، لە خۆشی، ناخۆشی، سەرما و گەرما، هیچ کات نەگۆڕێت و سپلە و بێ وەفا نەبێ بەرامبەر نیعمەت و بەخششەکانی اللَّه تعالی، ئەمە سیفاتی موسڵمانی یەکخواپەرست و موحیدە، کە بەڕاستی اللَّە تعالی ناسیووە، جیاواز لە کەسانی بەناو موسڵمان، کە هەرکات لەناخۆشی و خەم و ئازارن ڕوو لە اللَّه دەکەن و خۆیان بەکەسی چاک نیشان ئەدەن، هەر وەکو ئەو کوڕ و کچانەی کە ماوەیەکی زۆر چاوەڕێ بوون و ئاواتەخوازی ئەوە بوون بچنە ژیانی هاوسەریەتی، بۆیە زۆرێکیان کاتێ تەمەنیان دەگاتە کاتی ژن هێنان و شووکردن، ئەو کاتی زۆر ڕوو لە اللَّە دەکەن، دوعاکانیان بەردەوام ئەوەیە خوایە کەسی چاکمان پێ ببەخشی، زۆر تەقوا و دینداریان پێوە دیارە، جاکاتێ ژن هێنان و شوکردنیان تاخیر دەبێ بەردەوام بەناسیاو خزمەکانیان دەڵێن دوعامان بۆبکە مرازی دڵمان بێتە دی، زۆر دەترسێن و خەم دەخۆن، کاتێکیش اللَّە تعالی دەرگای ڕەحمەتیان لێدەکاتەوە، ژن دێنن و شوو دەکەن هەر زوو اللَّە لە بیر

دەکەن، لەیەکەم ڕۆژی مارەیی سنوری شـەرعی اللَّـە دەبەزێـنن، کـچەکە جوانی خۆی هەموو نیشانی خەڵک دەدات، زۆرێکیان برژانگ و نینۆکی عەمەلی و شتی دەسکرد بەکـاردێنن، بـۆ ڕۆژی گواسـتنەوە بەشـێوازێکی ناشەرعی، هەر زوو ڕەحمەتی اللَّـە لەبیـر دەکەن، شـوێن گێـژاوی هەواو ئـارەزووی نەفسـیان دەکەون، یـان کەسـانی تـر، کـاتێ خـزم و کەسـیان دەمرن، ڕوو لە مزگەوت و نوێژی جەماعەت دەکەن، پاش ماوەیەک ئیـتر واز دێنن لە چوونە مزگەوت، و دەگەڕێنەوە سەر پیشەی خۆیان و شـوێن ڕابـواردن و خۆشـی نەفسـیان دەکەون، یـان کەسـی تـر تووشـی چەن نیشانەیەکی نەخۆشـی سـەخت دەبـێ، زۆر دەترسـێ و بەردەوام دەچێـتە مزگەوت و ڕیشی دەهێڵێتەوە، کاتێکیش اللَّە تعـالی شـیفای دەدا، واز لە مزگەوت و ڕیش دێنن، بە کورتی تەنها لە کاتە ناخۆش و سەختەکان ڕوو لە اللَّە تعالی دەکەن، لە کـاتە خۆشـەکان دەسـت بە تـاوان و سـەرپێچی دەکەن، هەروەکو اللَّە ئەم نموونەیە دەهێنێتەوە:

﴿فَإِذَا رَكِبُوا۟ فِى ٱلْفُلْكِ دَعَوُا۟ ٱللَّهَ مُخْلِصِينَ لَهُ ٱلدِّينَ فَلَمَّا نَجَّىٰهُمْ إِلَى ٱلْبَرِّ إِذَا هُمْ يُشْرِكُونَ﴾[1]. واتە: هەر کاتێک خەڵکی (باوەڕ لاواز) سواری کەشتی دەبن، مەترسی نوقم بوون و تیاچوون ڕوویان تێدەکات، زۆر بەکوڵ، هاناو هاوار بۆ اللَّە دەبەن و بە دڵسۆزی و ملکەچیەوە باوەڕ دەهێنن، بەڵام کاتێک اللَّە

[1] - سوڕەتی العنکبوت ئایەتی: ٦٥

ڕزگاریـــان دەکـــات و دەگەنـــەوە وشـــکانی دەســـتبەجێ لـــە ڕێبـــازی یەکخواپەرستی دەترازێن و هاوەڵ و هاوبەش بۆ الله بڕیار دەدەن.

بۆیە ئەم جۆرە کەسانەش هەر زوو نیعمەتی اللّٰـه تعـالی لەبیـر دەکەن، لە هەموو ڕوویەکەوە دەگۆڕێن، شوێن حەزو ئارەزوویان دەکەون، ڕەحمەتان لێ بێت، ئەی بەندەکانی اللّٰه ئەگەر هاتوو ڕۆژێک لە ڕۆژان ژیانت گـۆڕا و خۆشی دونیا هاتە ناو لەپی دەستت، یان دونیات لێ بووە کون مشک و ژیانـت پڕبـوو لە ناخۆشـی، هەرگیـز نەکەی بگـۆڕێی و پشـت لە دیـن و شەریعەتی اللّٰـه تعـالی بـکەی ئەگینـا پشـتت زۆر بەسـەختی دەشـکێ و سەرنجام ژیانت وێران دەبێ.
کەوابوو هەموو کات اللّٰه تعالی لەبیربێ و هەست بەچاودێری بـکە، و لە خۆشـی و ناخۆشـی بەنـدەیەکی سـوڵحاو و ملکەچـی فەرمانەکـانی بە، دڵنیابە ئەوکات بەرزترین پلەی بەهەشت دەبێتە پاداشتت.



## ئەم ئایەتە سەرنجی ڕاکێشام ٢٦

ژیانی هەموو مرۆڤێک بەسێ قۆناغ تێدەپەڕێ، لە سکی دایکیەوە لە دڵۆپە ئاوێ دروست دەبێ و دوای دەبێ بە منداڵ، لەپاشان پێ دەگات و دەبێتە گەنج و لاو پاشان قۆناغی پیری و پەکەوتەی دێ، ماوەی هەر قۆناغێک چەند ساڵێکی کەم و کورتە، پازدە ساڵی منداڵی، کە هیچ خۆشی و لەزەتێکی نیە زۆرجار گریاوی لەبرسان و پاشان سی ساڵی گەنجی، کە زۆربەی کات خەریکی ئیش و کار و پارە پەیداکردنی بۆ بژێوی ژیان و ماڵ و منداڵت، ئەوەی دەمێنێتەوە گشتی تەمەنی پیرییە، ئەوسا پیری و سەد دەردی بەردەوام نەخۆشی و بێهێزی ئینجا اللّٰه تعالی دەزانێ ماوەی تەمەنی پیری هەر کەسەو چەند ساڵ ئەبێت، لەم بارەیەوە اللّٰه تعالی دەفەرمووێت: ﴿ٱللَّهُ ٱلَّذِی خَلَقَكُم مِّن ضَعۡفٍ ثُمَّ جَعَلَ مِنۢ بَعۡدِ ضَعۡفٍ قُوَّةً ثُمَّ جَعَلَ مِنۢ بَعۡدِ قُوَّةٍ ضَعۡفًا وَشَیۡبَةً یَخۡلُقُ مَا یَشَاۤءُ﴾[1]

واتە: اللّٰه هەر ئەو دەسەڵاتدارەیە کە ئێوەی لە بنەمایەکی لاواز و بێ هێز بە دیهینا، لەو ئاوو (نطفە)یە لەپاشان دوای بێ هێزیی و لاوازیی، هێزێکی پێدان، واتە: دوای بڕینی قۆناغی منداڵی گوڕی پێدان و کردنیە

[1] - سوڕەتی الروم، ئایەتی: ٥٤

لاو ئەوسا دوای هێزو لاویەتی، هێزی لێسەندن و پیـری کـردن بەمـەیلی خۆی بەدی دێنێ هەرچی بیەوێ.

بۆیە ڕەحمەتتان لێ بێت با ژیر و ئاقڵ بین، تاکو تەمەنمان گەنجە و هێز و توانامان هەیە، با بۆ خزمەتی ئیسلام سەرفی بکەین، چونکە تاکە شت بـۆ بەختەوەربوونمان لە دونیا تەنها پەیوەست بوونمانە بە ئیسـلامەوە، گشـت ڕێگا و ڕێبازەکانی تر مایەی خەم و ئازار و گومڕا بـوونە، بـا بەهەشـت و ڕەزامەندی اللّٰه تعالی نەگۆڕینەوە بە ژیانێکی کەم و کاتی دونیـای بـڕاوە، بۆ ئەوەی لە دوارۆژدا یەکێك بین لە کاروانی سەرفرازان.



## ٢٧ ئەم ئایەتە سەرنجی ڕاکێشام

اللَّه تعالى کە ژیانی دونیای دروست کرد بـۆ تـاقیکردنەوەی مرۆڤەکـان، هەموو شتێکی بۆ ڕوون کردنەوە، لە پێناو خۆشبەختی و سـەرفرازیان، کە ژیان چیە و چۆن بـژین و هەوڵ و مانـدوبوونیان لەپێنـاو چ شـتێک بـێ، بۆیان ڕوونکرایەوە کە بۆ تەوحید و یەکخواپەرستی بژین و ڕێگای شەیتان نەگـرنەبەر و بەخۆشـی و هەڵاو بەزمـی کـاتی دونیـا فریـو نەخـۆن و هەڵنەخەڵەتـێن، و کـارو کـردەوەی چـاکە بـکەن و ژیانیـان گشـتی بـۆ ڕەزامەندی اللَّه تعـالى بـێ، ئینجـا باسـەیر بکەیـن کە اللَّـه تعـالى چـۆن ئامۆژگاریەکی بە سۆزانەی گشت مرۆڤەکان دەکات، بۆ ئەوەی لە خۆشی بەهەشت بێبەش نەبن و پێیان ڕادەگەیەنێت کە پارێزگاری لە سنوورەکانی بکەن، و لەو ڕۆژە بترسێن، کە دەگەڕێنەوە قیـامەت کە بـاوک هیچـی پـێ ناکرێ بۆ کوڕەکەی و وە کوڕیشی هیچی پێ ناکرێ بۆ بـاوکی، تـا یەکـتر ڕزگار بکەن لە سزای ئاگر، کەچـی لە دونیـا بـۆ یەکـتر قوربانیـان ئەدا و ئامادەی خۆ بەختکـردن بـوون، بەڵام لە دواڕۆژ هیچیـان پـێ نـاکرێ بـۆ یەکتر، ﴿يَٰٓأَيُّهَا ٱلنَّاسُ ٱتَّقُواْ رَبَّكُمْ وَٱخْشَوْاْ يَوْمًا لَّا يَجْزِى وَالِدٌ عَن وَلَدِهِۦ وَلَا مَوْلُودٌ هُوَ جَازٍ عَن وَالِدِهِۦ شَيْـًٔا ۚ إِنَّ وَعْدَ ٱللَّهِ حَقٌّ ۖ فَلَا تَغُرَّنَّكُمُ ٱلْحَيَوٰةُ ٱلدُّنْيَا﴾[١]

[١] - سورەتی لقمان ئایەتی: ٣٣

واتە: ئـەی خەڵکینـە! خۆتـان لـە سـەرپێچی پـەروەردگار بپـارێزن و فەرمانەکانی جێبەجێ بکەن و لێی بترسن و لەو ڕۆژەش بترسن کـە هـیچ باوکێ هیچی لەدەست نایە بۆ کـوڕی خـۆی و هـیچ منـداڵێکیش هیچـی پێناکرێ بۆ باوکی خۆی. واتە: تکاو پاڕانەوە لەو ڕۆژەدا بە کردەوەی چاك نەبێت کەڵکێکی نیە، بۆیە تەنانەت منداڵیش فریای باوکی خۆی ناکەوێت بێگومان بەڵێنی اللَّه بەهاتنی ڕۆژی قیامـەت ڕاسـتە وریـابن! ژیـانی ئـەم دونیایە فریوتان نەدات.

بەڵێ ڕەحمەتان لێ بێت، الله تعالی ئەوەندە بە ڕەحمە گشت شتێکی بەبێ جیاوازی بۆ هەموو خەڵکی ڕوونکردۆتەوە، بۆیە بە گشـتی دەفەرمووێـت: ئەی خەڵکینە ﴿يَٰٓأَيُّهَا ٱلنَّاسُ﴾ وەکـو ئاگـاداریەک بـۆ گشـتیان، نەک ئەی باوەڕدارینە، بەڵکو بە تێکڕای خەڵکی ڕادەگەینێت، کە بزانن و تێ بفکـرن و بیر لە سەرئەنجامی خۆیان بکەنەوە و بەڵکوو ئامۆژگاریەکە کاریان تـێ بکات و ڕێگای ئیمان و بەهەشت بگرنەبەر.

کەوابوو بۆت ڕوون بوویەوە چ ڕۆژێکی سەخت و ناخۆشـمان لە پێشـە لە دواڕۆژ. بـۆیە بـاهەر یەکەمـان ژیـر و ئاقـڵ بـین، بەخۆشـی دونیـا هەڵنەخەڵەتین و تەمەنمان لە شـتی بێسـوودی دونیـای بەزایە نەدەیـن و ڕێگای تەوحید و ئیمان بگرینەبەر و خۆمان و کوڕ و کـچ و خێزانەکـەمان پەروەردەی تەوحیـد و یەکخواپەرسـتیان بکەیـن، بـۆ ئەوەی لە دواڕۆژدا بەبێ ترس و بەبێ خەمی بەرەو بەهەشتی پان و بەرین هەنگاو بنێین.

## ئەم ئایەتە سەرنجی ڕاکێشام ٢٨

بەختەوەربوون لە ژیانی دونیا بۆ موسڵمان پەیوەستە بە پابەند بوونی بە فەرمانی اللَّه تعالى پاشان پێغەمبەری ئازیز ﷺ، واتە تۆ ئەوکاتە لە دونیا بەختەوەر ئەبی کە بەدڵ و گیان گوێداری ئەمر و نەهی اللَّه تعالى پاشان پێغەمبەرەکەی بیت، چونکە ژیانی دونیا ئاڵۆز و پڕ لە سەختی و ناخۆشیە، اللَّه تعالى وای دروست کردووە تاکو تۆی مرۆڤ تاقی بکاتەوە، بۆیە هەر خۆی شایەنی فەرمان پێکردن و بڕیار دانە، بۆیە هەر کات فەرمانێکت بینی لە قورئان و سوننەتی پێشەوامان پێغەمبەری ئازیز ﷺ ڕاستەوخۆ تەسلیم و گوێداری بە، چونکە دڵنیابە سەرفرازی و خۆشبەختی تۆی پێوە بەندە، هەر بۆیە اللَّه تعالى لەم ئایەتە بیرمان دێنێتەوە کە پابەند بین بە فەرمانی پاشان فەرمانی پێغەمبەرەکەی ﷺ، دەنا ئەوکات گومڕاو سەرلێشواو ئەبین.

﴿وَمَا كَانَ لِمُؤْمِنٍ وَلَا مُؤْمِنَةٍ إِذَا قَضَى ٱللَّهُ وَرَسُولُهُۥٓ أَمْرًا أَن يَكُونَ لَهُمُ ٱلْخِيَرَةُ مِنْ أَمْرِهِمْ ۗ وَمَن يَعْصِ ٱللَّهَ وَرَسُولَهُۥ فَقَدْ ضَلَّ ضَلَٰلًا مُّبِينًا﴾[١]، واتە: بۆ هیچ پیاوێکی ئیماندار یان ژنێکی ئیماندار، نیە کاتێک کە اللَّه تعالى پاشان

[١] - سورەتی الاحزاب ئایەتی: ٣٦

پێغەمبەرەکەی ﷺ بڕیاری شتێک بدەن لە هەر بوارێک ئەوان سەرپشک بن لە ئەنجامدانی ئەو کارە، چونکە ئەوەی سەرپێچی بکات لە فەرمانی اللَّە تعالی پاشان پێغەمبەرەکەی ﷺ ئەوە ئیتر بە ئاشکرا گومڕاو سەرلێشێواوە.

کەوابوو ئەی ئەو کەسەی بە فەرمان و بڕیاری اللَّە تعالی پاشان پێغەمبەرەکەی ﷺ دڵ تەنگی، یاخود گوێدارنی ئەوە دڵنیابە یاخی بوونتە و نیشانەی دووڕوویت تێدایە، و تاکو زووە بۆ ئەوەی چێژی بەختەوەری ببینی تەسلیمی فەرمانەکانیان بە، ڕێگای گومڕای و سەختی و جەنجاڵی ژیان گشتی لەسەر پێچی کردنی فەرمانی اللَّە تعالی پاشان پێغەمبەرەکەی ﷺ دایە، بۆیە بەزەیت بەحاڵی پەشێوت بێتەوە کە دڵنیام دایم دڵ تەنگ و بێتاقەت و بێ هیوای لە ژیان بەهۆی پشت کردنت لە فەرمانی اللَّە تعالی پاشان پێغەمبەرەکەی ﷺ و دووربوونت لە ئیسلام سەراپای ژیانت پارچەیەکە لە ڕەشایی و دڵی داپۆشیوی، بۆ بەختەوەریت لە ژیانی دونیا و بەدەست هێنانی بەهەشت گوێداری گشت فەرمان و بڕیارێکی اللَّە تعالی پاشان پێغەمبەرەکەی بە ﷺ دڵنیابە یەکێک ئەبی لە کاروانی سەرفرازان.



## ٢٩ ئەم ئایەتە سەرنجی ڕاکێشام

اللَّه تعالی ئەم ژیانەی بۆ تاقیکردنەوەی مرۆڤ دروست کردووە، ئینجا گشت شتێکی پێ بەخشیوین، پێغەمبەری بۆ ناردووین ﷺ، یاسا و ڕێساو بەرنامەی بۆ داناوین کە ئیسلامە، ئاگاداری کردووینەوە، لە گشت چاکە و خراپەیەک، تەمەنی پێداوین بۆ ئەوەی ماوەیەک لە دونیا بژین، بۆ ئەوەی لە دواڕۆژ بڕو و بیانوومان نەبێت، بەوەی کە لە دونیا لە هەموو خۆشی و نیعمەتێک بێبەش بووین، بە پێچەوانەوە، گشت شتەکانی دونیا لە پارە، جوانی، هێز، هاوسەرگیری، منداڵ، تەواوی بەخشەکانمان بەسەر ڕژابوو، کەچی بیرمان لە خۆمان نەئەکردەوە کە مانەوە لە دونیا کاتیە، تەمەنێکی زۆر ژیاین لە بێ فەرمانی اللَّه تعالی و کوفر و نیفاق و دژایەتی ئیسلام، بۆیە لە قیامەت سەرشۆڕ و خەجاڵەتین، هەروەکو اللَّه عزوجل بیری مرۆڤەکان دەهێنێتەوە، و باسی پەشیمانی و گریان و ناڵەی ئەهلی دۆزەخ دەکات، کە داوا دەکەن بگەڕێنەوە بۆ دونیا تاکو چاکە بکەن و ڕێگای ئیسلام بگرنە بەر:

﴿وَهُمْ يَصْطَرِخُونَ فِيهَا رَبَّنَآ أَخْرِجْنَا نَعْمَلْ صَٰلِحًا غَيْرَ ٱلَّذِى كُنَّا نَعْمَلُ ۚ أَوَلَمْ نُعَمِّرْكُم مَّا يَتَذَكَّرُ فِيهِ مَن تَذَكَّرَ وَجَآءَكُمُ ٱلنَّذِيرُ ۖ فَذُوقُوا۟ فَمَا لِلظَّٰلِمِينَ مِن نَّصِيرٍ﴾[١]

[١] - سورەتی فاطر، ئایەتی: ٣٧

واتە: ئەوانە گریەو زاری و هاوارو قیژەو ناڵەیان لەناو دۆزەخدا لێ بەرز دەبێتەوەو بەکەساسیەوە دەڵێن پەروەردگارا: دەرمان بهێنەو ڕزگارمان بکە لەم حاڵە، مەرج بێت کارو کردەوەی چاك ئەنجام بدەین، نەك ئەوەی کە جاران دەمانکرد، لە وەڵامیاندا اللَّه عزوجل دەفەرمووێت: ئایا ئەوەندە تەمەنمان پێ نەبەخشین؟ ئەوەی بیەوێت بیرێك بکاتەوە تیایدا بیربکاتەوە؟! بێدارکەرەوەشتان بۆ هات، (دیارە هەموویان خەجاڵەت و سەرشۆڕدەبن و قسەیان نامێنێت)، بۆیە پێیان دەوترێت: کەواتە دە بچێژن سزای دۆزەخ، چونکە ستەمکاران هیچ پشتیوانێکیان نیە.

بۆیە تاکو لە ژیانین و فرسەتە با تەوبە بکەین و بگەڕێینەوە بۆ سەر ڕاستە شەقامی ئیسلام، و ئەو تەمەنەی ماومانە پەیمان و بەڵێن بدەین لەگەڵ اللَّه عزوجل کە تاکۆتا هەناسەی ژیان بەندەی بین و ڕێبواری ڕێی ئیسلامە پیرۆزەکەی بین، تا بەهەشت ببێتە شوێنی مانەوەی هەمیشەیمان.



## ئەم ئایەتە سەرنجی ڕاکێشام ٣٠

تاکو لە ژیانی و نەمردووی بیزانە هەر شتێک کە لە ژیانت دەیکەی یان دوای خۆت بەجێی بهێڵیت و دەرەنجامی کار و قسەیەکی تۆ بێت یان دەستت هەبێت تێیدا بە زۆر و کەم یان پشگیری هەر کارێک بکەیت خۆت بیکەیت یان کەسێکی تر گشتی لەسەرت حیسابە.

بۆیە ئاگاداربە برا و خوشکی من، چ دەکەیت و چی بەجێدەهێڵیت دوای خۆت!! لەناو خەڵک لەناو سۆشیاڵ میدیا بزانە چی پۆست دەکەیت و بڵاودەکەیتەوە لەوانە فەیسبوك و تیکتۆك و ئینستاگرام و تێلیگرام وئیتر گشتیان، کەسی وا هەیە بەس خەریکی بڵاوکردنەوەی پۆستی بێ مانا و بێ سوودە، هەیە بەس خەریکی بڵاوکردنەوەی پۆستە لە پشگیری کردن لە حزبەکەی کە بەدڵنیاییەوە لە ڕۆژی دواییدا لە ژێر ئاڵای ئەو حەشر و حیساباتی لەگەڵ دەکرێت و شتی وای دەخرێتە پەڵ و لەسەری حیساب دەکرێت کە خۆی نەیکردوون، بەڵکوو حزبەکەیی و مەسولەکانی کردوویانە، هەیە بەس گۆرانی و فیلمی خراپ و ڕەقس و سەما بڵاو دەکاتەوە، ئەمانە هەتا لانەبات و تەوبە نەکات لێی هەر لەسەری حیسابە، لەو دەقەیەی بڵاوی کردۆتەوە تا دونیا ماوە، ئیتر بەس تۆزێك بیر لەمە بکەوە چیت بۆ کۆدەبێتەوە تا ڕۆژی دوایی!!!

بۆیە ئاگاداربە بزانە چی پێش دەخەن بۆ قیامەتتان و چی لە دوای خۆتان بە جێــدەهێڵن!! ﴿إِنَّا نَحْنُ نُحْيِي الْمَوْتَىٰ وَنَكْتُبُ مَا قَدَّمُوا وَآثَارَهُمْ ۚ وَكُلَّ شَيْءٍ أَحْصَيْنَاهُ فِي إِمَامٍ مُبِينٍ﴾[1] واتە: بێگومــان هــەر ئێمــە مردووەکــان زینــدوو دەکەینەوە، وە هــەرچی کردوویانــە و دەیکــەن تۆمــاری دەکــەین لەگــەڵ ئاسەوارەکانیشیاندا، وە هەموو شتێکمان لە کتێبێکی ئاشکرادا (تۆمارگەی تایبەتدا) بە وردی تۆمار و ئامارکردووە.

سەرنجی ئەم بەشە بدە زیاتر: ﴿وَنَكْتُبُ مَا قَدَّمُوا وَآثَارَهُمْ﴾ هەرچیەک بیکەن لەسەریان دەنوسین و لەگەڵ ئاسەوارەکانیشیان.

کەوابوو بزانە گشت کاروکردەوەیەکت لای اللّٰە تعالی تۆمـار دەکرێـت، بەچاک و خراپەوە، کەوایە ژیر ئەو کەسەیە کە کارێک ناکات ببێتە هۆی چوونە دۆزەخی، هەمیشــە ترســی اللّٰـە تعـالی لە دڵیەتـی و بـۆ بەهەشـت تێدەکۆشێت.



[1] - سورەتی: یس، ئایەتی: ١٢

## ٣١ ئەم ئایەتە سەرنجی ڕاکێشام

موسڵمان لە ژیانی دونیا تێگەیشتووە بە تەنها بۆ ڕابواردن و گاڵتە و بەسەربردنی ساتە خۆشەکان نەهاتۆتە سەر زەوی، حیساب بۆ هیچ شتێک نەکات، زوڵم، تاوان هەرچی شتی ناپەسەند و خراپە بیکات، وەکو کەسانی بێباوەڕ و دوور لە ئیسلام، بەڵکو حیسابی بۆ بچوکترین شت دەکرد، ئازاری مێرولەیەکی نەئەدا و هەموو کەس لێی ئاسوودە و بێخەم بوون، ئەیانزانی مرۆڤێکی پاک و بێگەرد و بە سۆز و دڵ نەرمە، تەنها بەندە و عەبدی اللّٰەی خاوەن عەرشە و دوورە لە هەموو ڕێبازێکی جاهیلی و تەوحید تاکە ڕێگا و ڕێبازیەتی، بەڵێ ئەمە نیشانە و ڕەوشتی موسڵمانی ڕاستگۆیە، لە دونیا بەم شێوەیە ژیا، چونکە زانی بووی لە دادگای دوارۆژ گشت شتێکی ژیانی دونیا حیسابی لەسەرە و لێ پرسینەوەی لێدەکرێت، هەر بۆیە لەم ئایەتە پیرۆزە اللّٰە تعالی باسی بێ منەتی و حیساب بۆنەکردنی بێباوەڕان دەکات لە بەرامبەر ژیانی دونیا و دەفەرمووێت هەموو شتێکمان لێ هەڵماڵین و ئاشکرا کرد.

﴿وَبَدَا لَهُم مِّنَ اللَّهِ مَا لَمْ يَكُونُوا يَحْتَسِبُونَ﴾[١]

[١] - سوڕەتی الزمر، ئایەتی: ٤٧

واتە: هەندێک شت هەبوو لە دونیادا هیچ حیسابێکیان بۆ نەدەکـرد، بەڵام اللَّه تعالى هەمووی لێ هەڵماڵین و هەمووی ئاشکرا کرد!

خاکمان بەسەر ئاخۆ دەبێ چەند شتمان شاردۆتەوەو هیچ حیسـابێکمان بـۆ نەکردوە!

چەند گوناحمان کردوەو هیچ حیسابمان بۆ نەکردوە!

ئـازاری دڵـی چەن کەسـمان داوە تـاکو بەیـانی نەخەوتـووە و ئـازاری چێشتووە و حیسابمان بۆ نەکردووە!

غەدر و زوڵم و ستەم و جاسوسی و ناپاکیمان لە چەن کەس کـردووە و بە نهێنی بەرگریمان لەچەن کەسی بێباوەڕ و ناپاک بەرامبەر ئیسلام کردووە حیسابمان بۆ نەکردووە!

کەوابوو بـا لە ئێسـتاوە تـاکو زووە بەئاگـا بێیـنەوە، و ئەزیەت و ئـازاری کەس نەدەین و بەرگری لە کەسانی بێبـاوەڕ و خراپەکـار نەکەیـن، ببیـنە بەندەیەکی سوڵحاو بۆ اللَّه تعالى تاکو کۆتا هەناسە بۆ ئەوەی دووربین لە ناخۆشی و ئازاری ئاگری دۆزەخ و بەهەشت ببێتە شوێنی هەمیشەیمان..



## ئەم ئایەتە سەرنجی ڕاکێشام ٣٢

مرۆڤی ئاقڵ و بەتایبەت موسڵمان تێگەیشتووە ژیانی دونیا ماوە و ڕابواردنێکی کەمە، هەرچی لە ژیان بەدەستی دەهێنێ دەزانێ بۆ هەمیشەیی نیە، لە حەقیقەتی دونیا تێگەیشتوە کە بۆ هیچ کەسێك نەبووە و نابێت، بیری کردۆتەوە پێغەمبەران (سەلامی اللَّه تعالی لێ بێت) گشتی دونیایان جێهشت و ماڵئاوای هەمیشەیان کرد، هاوەڵان و پێشینانی ئوممەت و پیاوچاکان هەموو وەفاتیان کرد، وە دەبینێ پادشاو زاڵم و سەرۆکە ستەمکارە دڵ ڕەشەکان کە میللەت و گەڵەکەیان پشتیان بوون، و لە سەروەت و سامان و پارە و خۆشی گشت شتێکیان لە ژێر دەست بوو، بۆیە پەند لە تاقیکردنەوەی کەسانی پێش خۆی دەبینێ، و هەروەکو اللَّه تعالی بیری مرۆڤەکان دەهێنێتەوە، و باسی ئاسەواری خەڵکانێک دەکات کە لە خۆشی و هەبوونی دونیا زۆریان هەبوو، بەڵام سەرئەنجام اللَّه تعالی بۆ هەمیشە وونی کردن لەسەر زەوی.

﴿أَوَلَمْ يسِيرُوا فِي الْأَرْضِ فَيَنظُرُوا كَيْفَ كَانَ عَاقِبَةُ الَّذِينَ كَانُوا مِن قَبْلِهِمْ كَانُوا هُمْ أَشَدَّ مِنْهُمْ قُوَّةً وَآثَارًا فِي الْأَرْضِ فَأَخَذَهُمُ اللَّهُ بِذُنُوبِهِمْ﴾[1]. واتە: ئایا ئەوە بەسەر زەویدا نەڕۆیشتوون، تا تەماشا بکەن و سەرنج بدەن، سەرئەنجامی ئەوانەی پێش ئەمان چۆن بوو، چیان بەسەرهات؟ ئەوانە لەمان زۆر بەهێزتر بوون و جێ دەست و شوێنەواریان زیاتر لە زەویدا ئاشکرابوو، جا ئەوە بوو اللَّه بەهۆی گوناهەکانیانەوە لە ناوی بردن.

بەڵێ موسڵمانی ژیر لە بەرنامەکەی کە ئیسلامە بۆی روون بۆتەوە دونیا بۆ هیچ کەس نابێت، وە بینیویەتی کەسە خۆشەویستەکانی گشتی لێی جیابوونەوە، هەر ڕۆژەو هەواڵی مردنی کەسێکی بۆ دێنن، بۆیە زیاتر تێدەگا لە ژیانی دونیا کە هیچ نیە و خۆشییەکی کەمە، بۆیە هەوڵ دەدات بە شێوەیەک بژیت گشت ماندوبوون و تێکۆشانی تەنها بۆ بەدەستهێنانی ڕەزامەندی اللَّه تعالی بێت، لە پێناو بەدەست هێنانی بەهەشت، بۆیە لە خۆشی و ناخۆشی هەموو کات گوێڕایەڵی فەرمانی اللَّه تعالی بوو، کەوایە با ئێمەش یەکێک بین لەو بەندە ساڵحانە، بۆ ئەوەی لە خۆشی هەمیشەی بەهەشت بێ بەش نەبین.



[1] - غافر ٢١

# ٣٣ ئەم ئایەتە سەرنجی ڕاکێشام

ئـێمەی مـرۆڤ بـۆ ئەوەی لە دونیـا بـژین و کەموکـورتی و پێویسـتی ڕۆژانەمان تەواو بێت، ئەوکاتە لە نێوان مرۆڤەکان پێویستمان بە یەکتری دەبێـت، واتە اللّـە تعـالی مرۆڤـی وا دروسـت کـردووە لەم دونیـایە، کە بەتەواوی کامڵ و ڕێک و پێک نەبێ، هێزی زۆر و بێ سنوری پێنەداوە تا کۆتا تەمەنی بە تێری بمێنێتـەوە و برسـی نـەبێ، نـەخۆش نـەبێ، خـەم و ئازاری نەبێ، بە تەنها خۆی هەموو پێویستیەکانی ژیانی جێبەجێ بکات.

مرۆڤی وا هەیە لە ڕووی جوتیاری و داچانـدنی بـەرووبووم و سـەوزایی زیرەک و لێزانە، هەموو ساڵێک باشترین جۆری تەمـاتە، خەیـار، بەرهەم دێنێت، کەسی تر لە پەلەوەر بەخێو کردن دەستی باشـی هەیە، و دەزانـێ چۆن بەخێویان بکات، کەسـی تـر لە کـاری تـر شـارەزایە و بەم شـێوەیە مامەڵە و کڕین و فرۆشتن و لە نێوان یەکـتر دەکەن و تەواوی مرۆڤەکـان پێویستیەکانی یەکتر پڕ دەکەنەوە و بەم جۆرە درێژە بە ژیانیان ئەدەن.

﴿وَرَفَعْنَا بَعْضَهُمْ فَوْقَ بَعْضٍ دَرَجَـٰتٍ لِّيَتَّخِذَ بَعْضُهُم بَعْضًا سُخْرِيًّا وَرَحْمَتُ رَبِّكَ خَيْرٌ مِّمَّا يَجْمَعُونَ﴾[١] واتە: هەندێکیانمان بەرز کردۆتەوە بەسـەر هەندێکیانـدا بـە

[١] - سورەتی الزخرف، ئایەتی: ٣٢

چەنـدین پلـە لـە مـاڵ و سـامان و دەسـەڵات بـۆ ئـەوەی هەنـدێکیان، هەندێکیتر بکەنە بەرکار لە کارو باریاندا، واتە: یەکتر بەکار بێنن لە ئیش و کاری خۆیاندا و، سوود لە لێهاتوویی ئەزموونی یەکتر وەرگرن، چونکـە ئەگەر هەموویان، لە هەموو شتێکدا وەك یەك وابن، ئەو کاتە ئیش و کـار ناڕواو ئەوەستێت، خۆ ناشکرێت مرۆڤ هەمووی ئەندازیار، یان پزیشك، یا نانەوابێ.. هتد وە ڕەحمەت و میهرەبانی پەروەردگاری تۆ، لـە تـەواوی ئەوەی ئەوان کۆی ئەکەنەوە، لە سەروەت و دارایی دونیا باشترە.

بۆیە ئەگەر هاتبایە ژیانی دونیا بەم شێوەیە نەبـوایە مرۆڤەکـان لە هەمـوو ڕوویەکەوە تەواو و کامڵ بونایە و پێویستیان بە کەسی تر نەبوایە، ئەوکاتە تاقیکردنەوەی خوای گەورە بۆ مرۆڤەکان هەر یەکجار دەبوو و، بەهەشت و دۆزەخ و ژیانی دواڕۆژ نەدەبوو، کەس نە دەمرد، بەڵام بەو شێوەیە نـیە و دونیـا ژیـانێکی کـاتی و کەمە بـۆ ئەوە دروسـت بـووینە تـاکو تـاقی بکـرێینەوە، بە نەبـوونی و ناخۆشـی و نەخۆشـی دەیـان و سـەدان تاقیکردنەوەی تر.

کەوابوو گرنـگ ئەوەیە ئـێمەی موسـڵمان لەم ژیـانە حـاڵ و گـوزەرانیمان هەرچۆن بوو ڕێبازی تەوحید بەرنەدەین، لە پێناو ڕەزامەندی اللَّه تعالی و بەدەسهێنانی بەهەشتەکەی.

## ئەم ئایەتە سەرنجی ڕاکێشام ٣٤

ژیانی دونیا خۆشـیەکانی لە پـارە، ژن، منـداڵ، تەواوی شـتەکان لە ژێـر دەسـتی مـرۆڤن، بـۆیە زوو هەڵـدەخەڵەتێن و مـردن و قیـامەت بە دوور دەبینن، وادەزانن هەر بۆ ڕابواردن و خۆشی هاتوونەتە ژیان، بۆیە هەرچی بێ فەرمانی و خراپە و تاوانە ئەیـکەن، لە پێنـاو خۆشـی نەفـس و هەواو ئارەزوویان، دژایەتی ئیسلام و موسڵمانان دەکەن، گاڵتە بە ڕیش و عەبـا و نیقـاب و فەرمانەکـانی اللّـەی خـاوەن عەرش دەکەن، هەرچـی کـوفرە ئەیکەن، بیریان لە ئایەت و ئاگادارکردنەوەی اللّٰە تعـالی نەئەکـردەوە، کە ئەوانەی لەدونیا سەرپێچی بکەن و ڕێگـای گـومڕای و کـوفر بگـرنە بەر دۆزەخ و ئـاگر دەبێـتە جێگایـان، ئینجـا ئەو کەسـانە لە پاداشـتی سەرپێچیەکانیان ئـاگر دەبێـتە شـوێنیان و لە دۆزەخ هـاوار و نـاڵەی ئەم کەسانە هەڵدەستێ و هانا بۆ دەرگەوانـی دۆزەخ (مالـک) ئەبەن، کە داوا بکات لە اللّەی خاوەن عەرش لەم سزایە ڕزگاریان بکـات و بـۆ هەمیشـە بیانکوژێت.

﴿وَنَادَوْاْ يَٰمَٰلِكُ لِيَقْضِ عَلَيْنَا رَبُّكَۖ قَالَ إِنَّكُم مَّٰكِثُونَ﴾[1] واتە: دۆزەخیەکان هاوار دەکەن، ئەی مالك (کە فریشتەی سەرپەرشتیارە): دەبا پەروەردگارت بمانکوژێت، دەبا بمرین و کۆتایی بەم سەغڵەتیەمان بێت، لە وەڵامدا دەڵێت: بەڕاستی ئەوە جێتانە و تیایدا بۆ هەمیشە دەبێت بمێننەوە.

بیر بکەوە براو خوشکی من ڕەحمەتت لێ بێت بۆ دونیایەکی کاتی و بڕاوە بۆچی قیامەتی خۆت ئەدۆڕێنیت! بیزانە بەڕاستی ناڕەحەترین سزای دۆزەخ ئەوەیە مردنی تێدا نییە، ژیانێکە نە مردنە نە ژیانە، بەڵکوو ئەمە سەختترین سزایە، کە لە نێو ئاگری پڕ ئازار بیت، و نە بژیت و نە بمری، پەنا بە اللّٰه تعالی.

کەوابوو با لە ئێستاوە ببینە بەندەی اللّٰه تعالی، بۆ ڕەزامەندی ئەو بژین و بمرین لە پێناو بە دەستهێنانی بەهەشت، با بەرگەی ناخۆشیەکانی ژیانی دونیا بگرین، کە لەسەر ئیسلام دێتە ڕێمان، چونکە هەموو ئازار و ناخۆشی ژیانی دونیا ناگاتە یەک دەقەی ژیانی سەختی دۆزەخ، پەنا بە اللّٰه تعالی، لە دونیا هەرچەند لەناو ناخۆشی و ئازار بین دڵنیابن تێدەپەڕێ و کاتیە، بەڵام سەختی دۆزەخ هەمیشەییە، بۆیە با تەوحید بکەینە چرای ڕێگامان، دڵنیابن سەرفراز دەبن..

[1] - سوڕەتی الزخرف ئایەتی: (٧٧)

## ٣٥ ئەم ئایەتە سەرنجی ڕاکێشام

اللَّه تعالى ژیانی دونیای بۆ تاقیکردنەوەی مرۆڤەکان دروست کردووە، ئینجا ڕابواردن و خۆشیەکانی هەتا سەر نین، و اللَّه تعالى لە دەیان جێگای قورئان ئاگاداری کردووینەتەوە کە مانەوەمان بۆ ماوەیەکی کاتی و نادیارە، هیچ کەس بە مانەوەی خۆی نازانێ کە بۆ ماوەی چەن ساڵە، بۆیە مرۆڤ و بەتایبەت موسڵمان کەزانی ژیان کاتیە، زۆر وابەستەی نابێ بە جۆرێک وەکو بێ باوەڕ و کافرەکان هەموو خەم و هەوڵێکیان بۆ خۆشی دونیا و حەزو ئارەزوویان بێت، زوڵم و ستەم و دزی و داگیرکاری و لە خەڵکی بکەن لە پێناو خۆشی خۆیان، بۆیە ئەو بێباوەڕانەی لە دونیا غەرقی خۆشی بووبوون، لەدواڕۆژ بە سزایەکی سەخت و ڕیسواکەر پاداشتیان ئەدرێتەوە، چونکە خۆشی و ڕابواردنی خۆیان گشتی لە دونیا بینی بە زوڵم و زۆرداری و ناپاکی و دزی و جەردەیی.

هەروەکو اللَّه تعالى دەفەرمووێت: ﴿وَيَوْمَ يُعْرَضُ ٱلَّذِينَ كَفَرُوا۟ عَلَى ٱلنَّارِ أَذْهَبْتُمْ طَيِّبَٰتِكُمْ فِى حَيَاتِكُمُ ٱلدُّنْيَا وَٱسْتَمْتَعْتُم بِهَا فَٱلْيَوْمَ تُجْزَوْنَ عَذَابَ ٱلْهُونِ بِمَا كُنتُمْ تَسْتَكْبِرُونَ فِى ٱلْأَرْضِ بِغَيْرِ ٱلْحَقِّ وَبِمَا كُنتُمْ تَفْسُقُونَ﴾[1]

[1] - سورەتی الاحقاف، ئایەتی: ٢٠.

واتە: وە ڕۆژێـك ئەوانـەی کـە بـێ بـاوەڕن بەرامبـەر ئـاگر ڕائـەگیرێن و نیشانیان ئەدرێ پێیان ئەگوترێ: ئێوە لە ژیانی دونیادا، هەرچی خۆشی و، ڕابواردنێکتـان هـەبوو ئەنجامتانـدا، ئیـتر بەشـی ئێرەتـان نەهێڵایـەوە وە بەهرەوەر بوون پێیان ئینجا ئەمڕۆش پاداشت دەدرێتەوە بە سزای سـەرکز کەر، بەهۆی ئـەوە کـە بەناهـەق خۆتـان بـە زل دادەنـا لەسـەر زەوی وە بەهۆی ئەو گوناهو تاوانەوە دەتانکرد.

کەوابـوو ئەی بـراو خوشـکانم هەرگیـز دڵتەنـگ مەبە لەوەی کاتێـک کەسانێکی بێباوەڕ دەبینی لەخۆشی و نازو نیعمەتن، تـۆش لە نەبـوونی و هەژاریت بەخۆت بڵێ ئەی نەفس خەم مەخۆ هەرچۆنێک بـێ ئەم ژیـانە دەبڕێتەوە و کاتیە، بیـر لە ناخۆشـیەکانی دواڕۆژ بـکەوە، و بـزانە گشـت ناخۆشی و ئازاری دونیا ناگاتە یەک دەقەی ناخۆشی ناو ئـاگری دۆزەخ اللَّه تعالی پەنامان بدات، امین.

کەوایە ڕەزامەندی اللَّه تعالی و بەدەست هێنـانی بەهەشـت لە خۆشـی و ناخۆشـی دونیـا بـکە ئامـانجی سـەرەکیت، تـاکو دەبـیە یەکێـک لە نیشتەجێبووەکانی بەهەشت.



## ئەم ئایەتە سەرنجی ڕاکێشام ٣٦

ژیانی دونیا پڕیەتی لە خەڵکی باش و خراپ، نابێ موسڵمان گشت خەڵکی بەیەک چاو سەیر بکات، وابزانێ گشتی باشن یان خراپ، بەڵام ئەم ڕۆژگارەی ئێستا، کە سەردەمی نامۆ بوونی ئیسلامە، بوونی مرۆڤە پاک و بێگەردەکان زۆر کەمە، زۆرینەی خەڵکی شوێن حەزو ئارەزووی خراپی کەوتووە، پەنا بە اللَّه تعالی، بۆیە دەبێ زۆر ئاگاداربین لە بیستنی هەواڵ و ڕووداوەکان، نابێ شوێن قسەی خەڵکی کەوین و باوەڕ بکەین، چونکە زۆربەی جار ڕاست ناکەن و لە نەخۆشی و دووڕووی و ڕق و قینەی ناخیان قسە لەسەر هەموو شتێک دەکەن، بۆیە کێشە و ئاژاوەی لێ دروست ئەبێت، ئێستا کەس خۆشی کەسی ناوێ، کەزانی برادەری خاوەن شتێکە دڵی پێ ناخۆشە.

بۆیە دەست دەکات بە بوهتان و قسەی ناڕاست لەسەری،

﴿يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوٓاْ إِن جَآءَكُمْ فَاسِقُۢ بِنَبَإٖ فَتَبَيَّنُوٓاْ أَن تُصِيبُواْ قَوْمَۢا بِجَهَٰلَةٖ فَتُصْبِحُواْ عَلَىٰ مَا فَعَلْتُمْ نَٰدِمِينَ﴾[1]

واتە: ئەی ئەوانەی باوەڕتان هێناوە ئەگەر کەسێکی متمانەپێ نەکراو هەواڵێکی گرنگی بۆ هێنان، خێرا بڕوای پێ مەکەن، بەڵکو سەرنج بدەن،

[1]- سوڕەتی الحجرات ئایەتی: (٦)

لێــی بکۆڵنــەوە تــا بۆتــان ڕوون دەبێتــەوە، نــەوەکو ئــازارو ناخۆشــی و گیروگرفت بۆ خەڵکی دروست بکەن بەنەزانی، جا دوای پەشـیمان ببنـەوە لەو کارەی کەپێی هەستاون.

بۆیە ئیماندار ژیر دەبێ گوێداری فەرمانی اللّه تعالی بێـت، سـەیری ئەم بڕگەیە بکەن ﴿يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوٓاْ﴾ دەفەرمووێـت: ئەی ئەوانەی ئیمانـدارن، نەیفەرمووە ئەی خەڵکینە، بەڵکو ئامۆژگاریەکە بەتـایبەت بـۆ ئیمانـدارانە، چونکە کەسی باوەڕدار دوای گوتی گوتی خەڵکـی ناکەوێـت، بـۆیە بـراو خوشکی ئیماندارم باوەڕ بە هەمـوو قسـەیەک مەکە، بۆناسـینی کەسـەکان خۆت کەسەکە بیدوێنە و هەوڵدە بیناسە نەک لەدەمی خەڵکەوە بیناسـی، چونکە دڵنیابە بەتەمـای قسـەی خەڵـک نـاگەیە ئەنجـامێکی ڕاسـت بـۆ ناسینیان.

کەوابـوو بـۆ ناسـینی کەسـەکان ووردبـین بە، زوو بـاوەڕ مەکە و خـۆت تووشی تاوان و گوناهـ مەکە، لەبەر قسەی خەڵکـانی دووڕوو بـۆ ئەوەی اللّه تعالی لێت ڕازی بێت و بەهەشت بکاتە پاداشتت.



## ٣٧ ئەم ئایەتە سەرنجی ڕاکێشام

لە دونیا دوو دەستە هەیە لە مرۆڤەکان، بـاوەڕدار و بـێ بـاوەڕ، دەسـتەی باوەڕدار دیارە کە اللّٰه خاوەن عەرش پارێزگاریان لێدەکات و بەرنامەی بۆ ناردوونە لە ڕێگای پێغەمبەرانەوە (سەلامی اللّٰه لە هەموویان بێـت) و ئەو دەستەیەش بەیەک دەنگ پابەندی دەبـن، بەڵام کـۆمەڵەی دووەم ئەوەی بێ بـاوەڕن دژی بـاوەڕدارانن، و بەردەوام یەک هەڵوێسـتن بـۆ دژایەتـی کۆمەڵەی اللّٰه تعالی، بەڵام لەناو خۆیاندا نابنە برایەکی گیـانی بە گیـانی، ڕاستە هەموویان یەک ڕایان هەیە لە دژایەتی ئیسلام و موسڵمانان بەڵام بە هیچ شێوەیەک لە دڵەوە لەگەڵ یەکتر بەیەکەوە نین و پەرتەوازەن و چـارە و خۆشی یەکتریان ناوێت، سەیری ئەوروپا و ڕۆژئاوا بکەن، چۆن زوڵم و ستەم لە یەکتری ئەکەن، دەست درێژی بۆ سـەر ناموسـی یـەکتر ئەکـەن، کەس لە کەس ئەمین نیە کچانی خوار تەمەن هەژدە ساڵ دەست درێژیان ئەکرێتە سەر و زۆرینەیان کراونەتە ژن، و منداڵی زۆڵ و بێ باوك و دایك زۆرن بە هۆی دەست درێژیان بۆ سەر یەکتر، دۆزینەوەی کچێکـی پـاک کە نەبووبێتە ژن زۆر ئەستەمە، واتە بە کورتی هـیچ ڕەحـم و سـۆزێك لـە نێوانیان بوونی نیە.

هەر بۆیە اللّٰه عزوجل دەربارەی جوولەکەکان دەفەرمووێت:

﴿لَا يُقَٰتِلُونَكُمْ جَمِيعًا إِلَّا فِي قُرًى مُّحَصَّنَةٍ أَوْ مِن وَرَآءِ جُدُرٍ بَأْسُهُم بَيْنَهُمْ شَدِيدٌ تَحْسَبُهُمْ جَمِيعًا وَقُلُوبُهُمْ شَتَّىٰ ذَٰلِكَ بِأَنَّهُمْ قَوْمٌ لَّا يَعْقِلُونَ﴾[1] واتە: ئەوەندە ترسنۆكن كوشتارتان لەگەڵ ناكەن بە كۆمەڵ، مەگەر لەو شارانەدا بەقەڵاو خەندەق قاییمكراون، یان لە پشتی دیوارەكانیماڵەكانیانەوە، چونكە دژایەتیی ناو خۆیان دژایەتیەكی سەختە، وا دەزانیت هەموو پێكەوەن و كۆكن، لە كاتێكدا دڵەكانیان لێكجیان و یەك ناگرن، ئەوەش چونكە ئەوانە گەل و كۆمەڵێكن تێناگەن لە دەرەنجامی كاری خۆیان.

بەڵێ ئەوان بۆیە لە دڵەوە برا نین و ڕق و دوژمنداری لە نێوانیان هەیە، چونكە اللَّه پەرست نین و ئامانجیان لە ژیان تەنها تێركردنی نەفس و شوێنكەوتنی هەواو و ئارەزووە، بەڵام ئیمانداران وانین، بەڵكو بە هۆی باوەڕ و ئیمانەكەیان بە اللَّه سبحانە و تعالی دەبنە یەک دڵ و جەستە و یەك خوێن و ڕەنگ.

بۆیە پێش هەموو شتێک بۆ ئەوەی كار لەگەڵ موسڵمانان بكەین دەبێ ئیمانێكی بە هێز و پتەومان هەبێت تاكو بەرگەی برایەتی موسڵمانان بگرین، دڵمان خاڵی بكەین، لە ڕق و حەسودی، گومان، جاسوسی و ڕووپامایی و غەیبەت و بوختان، بە سووک سەیركردنی یەكتر، ئەوكات ڕەزامەندی اللَّه تعالی بەدەست دێنین، بەویستی الله تعالی.

[1] - سورەتی الحشر، ئایەتی: (١٤)

## ئەم ئایەتە سەرنجی ڕاکێشام ٣٨

دونیا بۆ مرۆڤەکان شوێنی ژیان بەسەر بردنە، بەڵام مرۆڤ بە تەنها ناتوانێ تێیدا بژیت، بۆیە پێویستی بە مرۆڤەکانی تر دەبێ، ئینجا لە نێو ئەو هەموو مرۆڤانە چەن کەسی نزیک و خوێنی هەن، کە خزمی تایبەتن، کە باوک، دایک، برا، خوشک، مام، خاڵ، پور.. هتد ئەمانە بۆ مرۆڤ ئارامی ڕووح و دەروونن، خۆشەویستی و ڕەحم و سۆزێکی زۆر لە نێوانیان هەیە، ئامادەن خۆیان بکەنە قوربانی خۆیان بە کوشتن بدەن لە پێناو دڵخۆشی کەسە نزیکەکانی هەموو ماندوبوون و هەوڵێکی ئەدات، بەڵام ئەم خزمایەتی خوێنیە تەنها سوودی هەیە بۆ دونیا، ئەوەتا اللَّه تعالی دەفەرمووێت: ﴿لَن تَنفَعَكُمْ أَرْحَامُكُمْ وَلَآ أَوْلَـٰدُكُمْ ۚ يَوْمَ ٱلْقِيَـٰمَةِ يَفْصِلُ بَيْنَكُمْ ۚ وَٱللَّهُ بِمَا تَعْمَلُونَ بَصِيرٌ﴾[١] واتە: هەرگیز نە خزمانتان و نە منداڵانتان سوودتان پێناگەیەنن و فریاتان ناکەون، لە ڕۆژی قیامەتدا، کە ئێوە لە بەر ئەوان دۆستایەتیان دەکەن لە ڕۆژی قیامەتدا اللَّه لێکتان جیا ئەکاتەوە(بڕوادارو بێ بڕوا)هەرکەسە ئەنێرێ بۆ جێگای شیاو بەخۆی ئەگەرچی کەس و کاریشتان بن و اللَّه بینایە بەوەی ئەیکەن و هیچی لێ ناشارێتەوە.

[١] - سوڕەتی الممتحنة، ئایەتی: ٣

بۆیە بزانە ڕەحمەتتان لێ بێت ئەگەر تۆ لە دونیا ئەهلی تەوحید و ئیمان نەبووی با زۆرترین خزم و کەس و پشتت هەبێ ئەوە لە ڕۆژی دوای سوودیان بۆتۆ نابێ و لێت جیا ئەبنەوە، دەبێ خۆت لە دونیا شارەزای تەوحید کردبێ و چاکە و کوفرت ناسی بێت، کەوابوو تاکو لە ژیانی هەوڵبدە خۆت فێری تەوحید و خۆشویستن و ڕق لێ بونەوە لە پێناو اللّٰه تعالى بکە، بۆ ئەوەی لە ڕۆژی دوایی گەر هەموو خزم و کەست لێت جیابوونەوە تۆ ئەهلی بەهەشت و کاروانی خواویستان بیت.



## ٣٩ ئەم ئایەتە سەرنجی ڕاکێشام

ژیانی دونیا گشتی تاقیکردنەوەیە، پڕیەتی لە ناخۆشی و ئازار، ئینجـا ئەو کاتانەی هەموو دەرگاکـان بەڕووت دائەخـرێن و ژیانـت تەنـگ ئەبـێ و بێزار ئـەبی لـە ژیـان، بـێ هیـوا مەبە و هەمیشـە میهرەبـانی اللّـە تعـالی بهێنەرەوە یادت! ئای چەند جار قەدەرەکـان بەهـۆیەوە ئـازاری زۆرمـان چەشتووە، چاوەکانمان پڕبووە لە فرمێسک، ئەم دونیا فراوانەمان زۆر لێ تەسـک بـۆتەوە، کاتێـک خەم دامـان دەگـرێ بە هـۆی لەدەسـتچوونی کەسێکی نزیکمان یان نەمانی نیعمەتێـک یـان هـاتنی بەڵایەک، بەڵام ئەو کـاتە نـازانین و لەبیرمـان چـووە کە لەوانەیە لە پشـت ئەو ناخۆشـییە بەخششـێکی اللّـە هەبێـت! لەوانەیە خۆشەویسـتێکمان وون کـردووە بـۆ یەکجاری، چۆتە لای اللّە، لەوانەیە ئەگەر بمابایە شەڕ و ناخۆشی و خەم و ماندووبوونێکی زۆر چاوەڕوانی بوایە، کە بە هیچ شـێوازێک نەیتـوانی بێت بەرگەی بگرێت، یان تووش بـوونی بە فیتـنە زۆرەکـانی دونیـا، وون بـوونەکەی ئەو بریتـی بـووە لە ڕەحمەتێـک لە لایەن اللّـە-ەوە، بەهـۆی دوعایەکی چاکی خۆیەوە، یان دوعای دایک و باوکییەوە، یـان کەسێک بووە ڕۆژێک چاکەیەکی لەگەڵ کردووە لە ناخەوە دوعایەکی بۆ کردووە! لەوانەیە خوشـکێک کە تووشـی تەڵاق دان دێـت و ترسـێکی زۆری لـێ دەنیشێ بۆ داهاتووی لە خەم و ئازار، وا گومان دەبات ئیـتر ژیـانی ئـەو

تەواو بوو، بەڵام تۆ چووزانی لەوانەیە پاش ئەو مێردە یەکێکی باشتر بێتە ژیانت! یان کاتێک دایکێک زۆر ئازار دەچێژێ بە دەست منداڵەکانی، بێ بەشە لە چاکەکانی، تخوا پێی بڵێن ئەم بارودۆخە بەردەوام نابێ، گومانەکانت چاک و باش بکە، ئەی دایکەکەم لەوانەیە اللّٰه هیدایەتییان بدات و سنگییان فراوان بکات و ببنە خزمەتکاری زۆر باش بۆت.

یان لەولاوە سەرێک بدە لە نەخۆشخانەکان، سەدەها و هەزارەها نەخۆش دەبینی ئومێدی چاک بوونەوە هەرگیز بەدی ناکەی، فرمێسک و تەمی خەم هەموو نزیکەکانی داگرتووە، تۆ چووزانی لەوانەیە اللَّـه بیەوێ پلەکانی ناو بەهەشتەکانی بۆ بەرز بکاتەوە و گەردێک تاوانی لەسەر نەهێڵێ، بیەوێ هەر لە دونیا ڕازیبوون و خۆشەویستی خۆی ببەخشێ، تۆ چووزانی لەوانەیە شیفا زۆر لێیەوە نزیک بێت.

بۆیە ڕەحمەتتان لێ بێت، بیری هەموو ئەوانەی لە ناخۆشی و تاقیکردنەوی سەختدان بهێنەوە و پێیان بڵێ: ﴿لَا تَدْرِي لَعَلَّ اللَّهَ يُحْدِثُ بَعْدَ ذَٰلِكَ أَمْرًا﴾[1] واتە: تۆ چووزانی لەوانەیە اللّٰه دوای ئەوە کار و بارودۆخێکی تر بێنێتە پێشەوە.

بۆیە هەرگیز نەکەن بێ هیوابن لە هیچ حاڵێك، چونکە تۆ نازانی کەی اللّٰه دەرگای رەحمەتی لێت دەکاتەوە، بۆیە هەمیشە ئارامگربە.

[1] - سوڕەتی الطلاق ئایەتی: (١)

## ئەم ئایەتە سەرنجی ڕاکێشام ٤٠

براکانم بابزانین اللَّه تعالی هەڕەشەیەکی توند و لەناو بردنێکی پڕ سزای بۆ کێ هەیە؟! کە بەم شێوە ترسناکە هەڕەشەی کردووە، بۆ گەورەترین و سەرداری هەموو پێغەمبەران محمد ﷺ کە ئەگەر قسانێک بکات بەناوی اللَّه وە بەبێ ئەوەی وەحی بۆ کرابێ، ئەوە لێی قبوڵ نەدەکرا.

هەروەکو الله تعالی دەفەرموویێت:

﴿وَلَوْ تَقَوَّلَ عَلَيْنَا بَعْضَ الْأَقَاوِيل * لَأَخَذْنَا مِنْهُ بِالْيَمِينِ * ثُمَّ لَقَطَعْنَا مِنْهُ الْوَتِين﴾[1]

واتە: ئەگەر محمد ﷺ بەدەم ئێمەوە هەندێ ووتە و قسەی هەڵببەستایە. بێگومان ئێمە بەدەستی خۆمان تۆڵەمان لێ دەسەند. وە پاشانیش شادەماری کە لە پشتەوە دەگات بە دڵی دەپچڕێنین، واتە: بە خراپترین شێواز لەناوی دەبەین.

کە حاشا هەرگیز پێشەوای ئازیزمان ﷺ ئەمەی نەکردووە و شتێکی بە حەزی خۆی دانەهێناوە لە شەریعەتی ئیسلام.

﴿وَمَا يَنطِقُ عَنِ ٱلْهَوَىٰٓ﴾[2] واتە: وە قسەو گوفتاری (پێغەمبەر ﷺ) لە ڕووی هەواو هەوەسەوە نیە، جا کەسێ ئاوابێ چۆن ڕێگە ون ئەکات؟!

---

[1] - سورەتی الحاقة، ئایەتی: (٤٤ تا ٤٦)

[2] - سورەتی النجم. ئایەتی: (٣)

بەڵکو هەرچ فەرمانی کردووە گشتی وەحی و ئەمری اللَّه تعالی بووە.

﴿إِنْ هُوَ إِلَّا وَحْيٌ يُوحَىٰ﴾[1] واتە: ئەو قورئانەی کە ئەو دەیڵێت، جگە لەوە کەبە وەحیی بۆی دەنێرێ، هیچیتر نیە، واتە: ئەم قورئانە هەر لەلایەن خواوەیە.

ئەمە چ جای ئەوەی کە پێغەمبەر نەبێت و بە ڕای خۆی قسە بکات!!

ئەمە بەڵگەیە لەسەر ئەوەی کە کەس بۆی نیە هیچ شتێکی بە حەزو ئارەزووی خۆی بڵێت لەسەر ئەم دینە بەناوی اللَّه تعالی ئەگەر پێغەمبەرێکی نێردراویش بێت، چ جای کەسانی تر کە قسە بکەن لە دینی اللَّه دا بە ئەقڵ و بۆچوونی خۆیان شت دابهێنن و دابتاشن و بە بۆچوونی خۆیان لێک بدەنەوە، ئەمە گومڕایە پەنا بە اللَّه تعالی.

کەوابو هەمیشە ئاگاداربە براکەم هەرگیز نەکەی حەق ببەستیتەوە بە هیچ کەس و مەلا و بانگخوازێک و مافی ئەوەی بدەیتێ بەناوی دینی اللَّەوە بە ڕای خۆی قسە بکات، بەبێ ئەوەی هیچ بەڵگەیەکی پێ بێت و ئینجا خەڵکیش پەیوەست بکات، بە شێوەیەك اللَّه بپەرستن کە خۆی دەیەوێت و بە پێغەمبەرەکەی ﷺ پێی گەیاندووین.

بۆیە بۆ هەموو کێشەو شتێک بگەڕێوە بۆ بەڵگەی قورئانی پیرۆز و فەرموودەی پێغەمبەری پێشەوا ﷺ نەک فلان مەلا و گرووپ وایان گوت و وا دەبێت، تاکو لە دونیا و دواڕۆژ سەرفراز و بەختەوەربیت.

[1] - سورەتی النجم، ئایەتی: (٤)

# له کۆتایی

براو خوشکانم بۆمـان ڕوون بـوویەوە لەم کتێـبە کە ئـێمەی موسـڵمان، چ بەرنامە و شەریعەتێکی پڕ لە جوانی و دادوەریمان هەیە، کە اللَّه تعالی ئەم قورئانەی بۆ ئێمەی موسڵمانی کردۆتە ڕەحمەت و خۆشـی و بەخـتەوەری ئەگەر دەستی پێوە بگرین، چونکە ئەم قورئانە ڕێگا ڕۆشنکەرەوەی شـەوە زەنگ و تاریک و وێڵەکانە، ئارامی و ڕووناکی دڵە مردووەکانە، تەنـانەت ڕەحمەت و میهرەبانیە بۆ سەرجەم بوونەوەران، تـاکە یاسـای سـەر ڕووی زەوییە بۆ خۆشبەختی و کامەرانی.

بۆیـە پێغەمبـەری ئـازیز ﷺ ئامۆژگـاری کـردووینە بـۆ ئەوەی لە دونیـا سەرلێشواو نەبین، دەست بە قورئـانەوە بگـرین، هەروەک فەرمـوویەتی:

(تَرَكْتُ فِيكُمْ شَيْئَيْنِ لَنْ تَضِلُّوابَعْدَهُمَا: كِتَابَ اللَّهِ وَسُنَّتِي)[1]

واتە: دوو شـتم لە ناوتانـدا بەجـێ هێشـتووە ئەگەر دەسـتی پێـوە بگـرن هەرگیز گومڕانابن ئەویش قورئان و سونەتە.

[1] - أخرجه الدارقطني في "السنن" (٢٤٥/٤) ، والبزار في "مسنده" (٨٩٩٣) ، والحاكم في "المستدرك" (٣١٩) ، وأبو بكر الشافعي في "الغيلانيات" (٦٣٢) ، والبيهقي في "السنن الكبرى" (٢٠٣٣٧)

بۆیە هەر فەرمانێك لە قورئان و فەرموودە شیرینەکان هاتبوو، پێویستە موسڵمان ملکەچی بێت تاوەکو اللَّه تعالی ژیانێکی پڕ لە خۆشی و نازو نیعمەت ببەخشێت بە هەر یەکێکمان لە دونیا و دوارۆژ.

کوفر بۆ سەرخستنی یاسا دەسکرد و حەزە پیسەکانیان، تەواوی قوربانی و هەوڵی خۆیان ئەدەن بۆ بڵاوکردنەوەی، کەچی ئێمەی موسڵمان لە خەوی خەفڵەت و بێئاگای نغرۆر بووینە، هەر خەمان خۆشی و ڕابواردنە کاتی و بڕاوەی ئەم دونیاییە.

بۆیە برایانم ڕەحمەتتان لێ بێت با هەر یەکەمان لای خۆیەوە، هەوڵ بدات کەسە نزیکەکانی لە قورئان و حوکم و فەرمانەکانی الله تعالی شارەزا بکات، تاکو کۆمەڵگامان جیلێکی نەوەی قورئانی تێدا دروست دەبێ و خۆشەویستی اللَّه تعالی و قورئان نەگۆڕنەوە بەهیچ خۆشی و ڕابواردنێکی ژیانی ئەم دونیا کاتیەدا، تاکە هەوڵ و کۆششیان ژیانی دوارۆژ و بەهەشت دەبێت.

اللهم اجعل القرآن الكريم قائدنا وسائقنا الى جناتك جنات النعيم.

براتان: عبداللَّه خاکی

خوێنەری بەرێز: داوام وایە دوای خوێندنەوەت ئەم کتێبە بیدەی بە هاوڕێی و ناسیارەکانت تاکو بۆت ببێتە خێری نەبڕاوە بە ئیزنی خوی گەورە.